هاشم ساڵح

# فیکری خۆرئاوا





وەرگێڕانی:
شوان ئەحمەد



هاشم ساڵح

# فیکری خۆرئاوا

وەرگێڕانی:

شوان ئەحمەد



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

هەولێر - هەرێمی کوردستانی عێراق

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
شەقامی گوڵان - هەولێر
هەرێمی کوردستانی عێراق
هەگبەی ئەلیکترۆنی aras@araspress.com
وارگەی ئینتەرنێت www.araspublishers.com
دەزگای ئاراس لە ٢٨ تشرین (٢) ١٩٩٨ هاتووەتە دامەزران

هاشم سالح
فیکری خۆرئاوا
وەرگێرانی: شوان ئەحمەد
کتێبی ئاراس ژمارە: ١٢٩٠
چاپی دووەم ٢٠١٢
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
چاپخانەی ئاراس - هەولێر
ژمارەی سپاردن لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ٦٥٥ - ٢٠١٢
نەخشاندنی ناوەوە و رازاندنەوەی بەرگ: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل

ژێنک:
ژمارەی پێوانەیی ناودەوڵەتیی کتێب
ISBN: 978-9966-487-59-1

## پێڕست

## ئەزموونم لەگەڵ فیکری خۆرئاوا

بەوپەڕی راشکاوی و بێ هیچ پێچ و پەنایەک دەڵێم: گەر دەرفەتی ئەوەم بۆ هەڵنەکەوتایە بەر لە چارەکە سەدەیەک زیاتر لە ئێستا بچمە ئەوروپا، ئەوا دەژیام و دەشمردم بەبێ ئەوەی هیچ شتێک تێ بگەم! ئەزموونی ئەوروپا یەکلاییکەرەوە بوو، ئەویش لەبەر چەند هۆکارێک. یەکەمیان بواری ئەوەت دەداتێ لە خۆت و ژینگەی سەرەتاییت و دەوروبەرت دوورکەویتەوە، بەکورتی رێگەت دەدا تا لە دوورەوە بڕوانیتە رابردووی خۆت و سەیری بنج و بناوانی خۆت بکەیت. واتە بواری ئەوەت بۆ دەڕەخسێنێ تا کێشەکانت لەگەڵ خۆتدا یەکلایی بکەیتەوە و بەمجۆرەش سەرشانت سووک بکەیت. دووەمیان ئەوەیە بوارت دەداتێ تا زمانێکی ئەورووپی مۆدێرن فێر ببیت، زمانێک کە پڕیەتی لە سەرچاوەی هەمەجۆر. تەنانەت نەمدەتوانی بە شێوەیەکی مێژوویی لە مێژووی عەرەب و ئیسلام تێ بگەم، گەر هەندێک کتێبی سەرەکیم بەزمانی فەرەنسایی نەخوێندبایەتەوە. بەتایبەت زۆربەی زۆری ئەو کتێبانە– گەر هەمووشیان نەبێت–، وەرنەگێڕدراونەتە سەر زمانی عەرەبی. ئەگەر وەریشگێڕدرابن ئەوا بەدەگمەن تیایاندایە وەرگێڕانێکی راست و دروست یان باوەڕپێکراو بێت..

تەواوی ئەو دۆزینەوە مەعریفییانەی لە سەدەی شازدە و تا ئەمڕۆ لە ئەوروپادا ڕووی داوە، گەر بهاتبایە و بە تەنیا پابەندی زمانی عەرەبی بوومایە، ئەوا لەو شتانە بێ ئاگا دەبووم. کاتێک ئەم قسانە دەکەم هەست بەشانازی ناکەم، هێندەی هەست بەجۆرێک لە خەم و بێزاری دەکەم و دەپرسم: هەتاکەی لە زمانی ئێمەدا ئەو شۆڕشە زانستی و فەلسەفییانە

نەناسراو بەبن؟ کەی زمانی ئێمەش دەبێت بەزمانی زانست و فەلسەفە، وەکی زمانی ئینگلیزی و فرەنسایی و ئەڵمانی و تەواوی زمانە مۆدێرنە زیندووەکانی تر؟ کەی تەواوی ئەو سەرچاوانەی کە پێویستە، لەزمانی ئێمەشدا دەبێت؟ سێیەمیان ئەوەیە کە دوورکەوتنەوە لە خود، وات لێ دەکات چاکتر خۆت بناسیت. واتە بۆ ئەوەی خۆت بناسیت، پێویستە گەر بۆ چرکە ساتێکیش بووە لە خۆت و لە سەرجەم ئەو مێژوو و کەلەپوورەی دەستیان لە دروستکردنتدا هەبووە جیا ببیتەوە.

دواجار هۆکارێکی سەرەکیی تر هەیە کە مەرجی سەرجەم ئەو هۆکارانەیە پێشتر باسمان کردن، ئەویش بریتییە لە: ئازادیی بیرکردنەوە و رادەربڕین. دەکرێت بڵێین: شکۆمەندی و شارستانییەت و بالادەستیی ئەوروپا، بەرهەمی ئەو ئازادییەیە. ئەزموونی جیابوونەوەی ئەوروپا لە خۆی، واتە جیابوونەوەی لە شتە سلبی و نەخوازراوەکانی، بەنرخترین شتێکە لە ژیانمدا بینیبێتم. لە کاتێکدا سەرقاڵی نووسینی ئەم وتارەم، زنجیرە وتارێکی رۆژنامەی (ڤیگارۆ)م لە بەردەمدایە کە ماوەیەکی کەمە دەستی بە بڵاوکردنەوەیان کردووە. ئەو وتارانەش تایبەتن بەم پرسیارە: رۆشنبیرە مەسیحییەکانی ئەوروپا و فرەنسا بەتایبەتی، چییان لێ هات؟

شایانی باسە گەورە رۆشنبیرانی فرەنسا و بەتایبەتی رۆشنبیرە ئاینییەکان، بەشدارن لەم تەوەرەدا. ئەگەر چی ئێمە دەزانین ئاقاری ئاینی لە کولتووری فرەنسایی بەتایبەتی و ئەوروپایی بەگشتی، بەهۆی تەشەنەسەندنی مۆدێرنە لەناو کۆمەڵگەدا پاشەکشەی کردووە و کەنارگیر کەوتووە. ئێمەی رۆشنبیران کاتێک قسە لە فیکری ئەوروپایی دەکەین، بەدەگمەن باس لە ئاقاری (ئیماندار) دەکەین، چونکە پێمان وایە ئەم ئاقارە کۆتایی هاتووە و ئاسەواری نەماوە. ئێمە تەنیا گرینگیی بەئاقاری "ژان پۆڵ سارتەر" یاخۆ "میشێل فۆکۆ" یان "جێڵ دیلۆز" دەدەین کە بەتەواوەتی، دەستبەرداری ئاینی مەسیحی بوون و مەسەلەی ئاینیان فەرامۆش کردووە.

ئەوەمان بیر دەچێت ئەو ئاقارە فیکرییەی مەسیحییەت ژێدەریەتی، بەتەواوەتی لەسەر گۆڕەپانی فرەنساییدا نەسڕدراوەتەوە.

بێگومان ئەم ئاقارە باجی فێندەمێنتالیزم و دادگاکانی پشکنینی دا کە لە سەردەمانی پێشوودا لە ئارادا بوو، بەجۆرێک کەس زاتی ئەوەی نەدەکرد سەر لە ئاستیدا هەڵبڕێت. ئەمە شتێکی سروشتییە، بەڵام هەنووکە لە خۆرئاوادا فێندەمێنتاڵیزم هەڕەشە نییە بۆ سەر کەس و مەترسیش بۆ سەر ئازادیی فیکر دروست ناکات، لەبەرئەوەی وجوودی نییە یاخۆ تاڕادەیەکی زۆر بنکەی کۆمەڵایەتی لاواز بووە. ئەمە لە کاتێکدا ئاقاری مەسیحی لیبراڵی ئامادەگی لە گۆڕەپانەکەدا هەیە. سەرەڕای ئەوەش ئەو ئیمانداریە مەسیحییەی لە ئەورووپادا باوە زۆر جیاوازە. لەبەرئەوەی بیرو بۆچوونە زانستییەکان و فەلسەفەی نوێ بەڕادەیەک تێکەڵ بوون پێی کە تەواوی خەسڵەتە دیسپۆتیزمی و تیرۆریستەکانی، ئیمانداری سەدەکانی ناوەڕاستی لە دەست داوە. لێرەدا کە باس لە ڕۆشنبیرە مەسیحییەکان دەکەین، مەبەستمان گەورە نووسەرانی وەک "هنری بیرگسۆن"ی فەیلەسووف و نووسەری گەورە "شارل بیگی" و "جۆرج برنانۆرس" و "فرانسۆ مۆریاک" و "جان گیتۆن" و فەیلەسووفی پرۆتستانتی "پۆل ریکۆر"ە. تەواوی ئەمانە لە ڕۆشنبیریی نوێ تێگەیشتوون، بەڕادەیەک ئیمانداریان بەفەلسەفەیەک دەچێت کە لە هەموو کۆت و بەندێک بەدوورە.

بەم پێیە پێویستە بەهەڵە لە وشەو زاراوەکان تێنەگەین، چونکە لێرەدا تێرمی ئاین یاخۆ ئیمانداری یان مەسیحی، ئەو مانایە ناگەیەنێت کە پێشتر هەیبووە. واتە ئەوەی ئێستا ئیمانی پاش ڕۆشنگەرییە نەک پێش ڕۆشنگەری. ئیمانێکە ڕۆحانییەتی ئینجیل و بەها ئەخلاقییە باڵاکان، لە مەسیحییەت دەخوازێت و لەمەبەدەر واز لە شتەکانی تر دێنێت. گەر نەهاتمایەتە ئەورووپا نەمدەزانی ڕێگەیەکی تر بۆ تێگەیشتن لە ئاین هەیە، جیاواز لەو شێوازە کۆنەی سەدان ساڵە بۆمان ماوەتەوە و کۆتی ئەو بیر و

بۆچوونە کۆن و بەسەرچووە دەبووم و وام دەزانی ئەوە تەنیا شتێکی مومکینە. واتە وەک کەسێکی کوێر و نابینا دەمامەوە. من هیچ شەرم لە وتنی ئەم شتانە ناکەم و بەئاشکرا باسیان دەکەم. بەڵێ گەورەترین کەشفی مەعریفی کە بۆم هەڵکەوتبێت ئەمە بوو، بەبۆچوونی من ئەمە لە دۆزینەوەکانی "نیوتن" و "ئەنشتاین" گرینگترە، چونکە ئەمە ئازادیی رۆحە و ئازادکردنی گیانە لە کۆت و پێوەندەکانی و لە زیندان و تیرۆری تیۆلۆجیا.

بەڵێ رۆح لە سەردەمە نوێکاندا، بارگەی خۆی لە ئەوروپادا خست و لەو سەردەمەشەوە تەواوی هونەر و زانست و ئەدەب و فەلسەفەکان بووژانەوە و تێگەیشتنیان بۆ ئاین گۆڕانکاری بەسەردا هات.

وەکی دەزانرێت پرۆژەی دەستووری ئەوروپایی کە بەسەرپەرشتی "ڤالێری جیسکاردیستان"ی سەرۆکی پێشووتری فەرەنسایە لە قۆناغی ئامادەکردندایە. ئەم دەستوورە کە پوختەی بەهاو شارستانییەتی ئەوروپایی تێدایە، هیچ ئاماژەیەکی بۆ ئەو میراتییە مەسیحییەی کیشوەری ئەوروپا تێدا نییە. ئەمە پاپای زۆر دڵگران کرد و بەهەموو توانای خۆی پاڵەپەستۆی هێنا، بۆ ئەوەی برگەیەک لەو دەستوورەدا هەبێت باس لە بوون و رەوایەتی ئەو میراتییە مەسیحییە بکات، بەڵام کەس گوێی پێ نەدا و هەوڵەکەی بەهەدەر چوو. کۆشکی ئەلیزێش بەبیانووی بێلایەنی و عەلمانییەتەوە، رێگەی بەخۆی نەدا لە بەرژەوەندی پاپا داخڵ بەو کێشە ببێت. تەنانەت هەندێک سەرکۆنەی هەرجۆرە بەشدارییەکی پیاوانی ئاینییان لەم مەسەلەیەدا دەکرد. لەبەرئەوەی دەستوور ئاراستەی تەواوی ئینسانەکان دەکرێت، نەک تەنیا بۆ مەسیحییەکان بێت. ئەم دەستوورە گەردوونییە و ئاراستەی مرۆڤ کراوە، لە هەر کوێیەک بێت و رەگەزی ئەتنیکی و ئاینی هەرچییەک بێت.

کەواتە دەستووری ئەوروپایی لە فەلسەفەی "کانت" و رۆشنگەرییەوە سەرچاوە دەگرێت، نەک لە عەقیدەی کڵێسای کاتۆلیکی و ڤاتیکانەوە. بەمجۆرە وا سەرلەنوێ دەگەڕێینەوە بۆ ئەو ململانێ خوێناوییە، واتە

دەگەڕێینەوە بۆ ململانێی نێوان فەیلەسووفان و پیاوانی ئاینی، بەڵام پێ دەچێت ئەورووپا گەشتبێتە ئەوەی ئەم ململانێیە تێپەڕێنێت. ئێستا لە فیکری ئەورووپاییدا سەردەمێکی تازە دێتە پێش، ئەویش سەردەمی ئاشتکردنەوەی نێوان "ئیمان و ئەقڵ، فیکری ئاینی و فیکری زانستی، تیۆلۆجیا و فەلسەفەیە".

بەڵێ من ئیرەیی بە ئەورووپاییەکان دەبەم، دەرهەق بەو پێشکەوتنە کەم وێنەیەی بەدیان هێناوە. کاتێکیش سەیری ئەوان و خۆمان دەکەم، خەریکە دووچاری فۆبیایەکی گەورە دەبم و وام لێ دێت باوەڕ نەکەم کە ئێمەش لەسەر هەمان ئەستێرە دەژین!

## قەیرانی شارستانییەتی خۆرئاوا – مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنە – (خوێندنەوەیەک لە فیکری هانز کۆنگ)دا

ڕۆشنبیرانی جیهانی سێیەم کاتێک بۆ یەکەم جار دێنە خۆرئاوا و تێکەڵ بەو کۆمەڵگە مۆدێرن و کولتوورە تازەیە دەبن، ئەستەمە بتوانن هەڵوێستێکی ڕەخنەگرانە وەرگرن، لەبەرئەوەی دەکەونە ژێر سیحر و کاریگەریسی ئەو شارستانییەتەی، خاوەنی تەکنۆلۆجیایەکی پێشکەوتووە و لەسەر هەموو ئاستەکانیش بۆڕی تەواوی کۆمەڵگەکانی تری دنیای داوەتەوە. کەواتە ئەو ڕۆشنبیرانە پێویستییان بە ماوەیەکی زۆر مانەوە و تێکەڵاوبوون هەیە لەگەڵ ئەو شارستانییەتەدا، بۆ ئەوەی لە نزیکەوە ئاشنابن پێی و هەڵوێستی ڕاست و دروستی لێ وەربگرن. واتە هەر ڕۆشنبیرێکی جیهانی سێیەم پێویستی بە کاتی تەواو هەیە، بۆ ئەوەی کولتووری خۆرئاوا بناسێت و بەو مێژووەش ئاشنابێت کە مۆدێرنەی دروست کرد، بۆ ئەوەی بە تەواوەتی بتوانێت حوکمی بەسەردا بدات. تەنیا لەو کاتەشدا هەڵوێستی لە بازنەی کارو کاردانەوە دەربازی دەبێت و پێ دەنێتە قۆناغێکی بالاتر کە قۆناغی ئەقڵ و دانایی و بەراوردکارییە. بەمەش دەتوانێت لە ناو پرۆژەی مۆدێرنەدا، ڕاست لە هەڵە و پۆزەتیف لە نەگەتیف جیا بکاتەوە.

پێویستە پرۆسەیەکی تاوتوێکردنی گونجاو دەست پێ بکەین، بۆ ئەوەی بزانین چۆن چۆنی لەگەڵ مۆدێرنەدا هەڵسوکەوت بکەین و چی لێ وەردەگرین و چیش فەرامۆش دەکەین، چونکە هەموو شتێکی ڕاست و دروست نییە و هەموو شتێکی بۆ ئێمە و کولتووری ئێمەش گونجاو نییە. ماوەیەکی زۆرە ڕەخنەگرتن لە مۆدێرنە دەستی پێ کردووە و لەم ڕووەوە چەند هەوڵێک

جێگەی سەرنجم بووە، لەوانە هەوڵی: "میشێل فۆکۆ و یۆرگن هاپرماس و قوتابخانەی فرانکفۆرت و.. هتد". بەم دواییانەش چاوم بە هەوڵی یەکێک لە تیۆلۆجیست و بیریارەکانی ئەڵمانیا کەوت بە ناوی "هانز کۆنگ"ەوە. ئەم پیاوە مامۆستایە لە زانکۆی (تۆبنگن)، واتە لە هەمان ئەو زانکۆیەدا کە لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەمدا "هیگڵ و هۆڵدەرلین و شیلینگ" تیایاندا خوێندووە. ئەو سێ بیریارە لەو کۆلیجەدا کۆلێجی خوداناسی پرۆتستانتی هاورێی یەک بوون.

"هانز کۆنگ" بە تەنیا تیۆلۆجیست نییە، بەڵکو بیریاریشە، واتە ئاگەداری تەواوی ئەو ئاقارە فەلسەفی و زانستییانەیە کە لە سەدەی شازدەهەمەوە مۆدێرنەیان هێناوەتە ئارا. بێگومان "کۆنگ" زیاد لە هەر مەسەلەیەکی تر گرینگی بە ئاین دەدات و دەیەوێت ئەو ئیعتیبارەی بۆ بگێرێتەوە کە مۆدێرنە فەرامۆشی کردبوو، بەڵام سەرەڕای ئەوەش هەر بیریارێکە بە ستایلە ئەڵمانییەکە، واتە بیرکردنەوەی بەشێوەیەکی یۆنیڤێرسالی و هەمەلایەنانەیە.. بە کورتییەکەی ئەو بیریارێکە لە شێوەی "هیگڵ" و بە چارەنووسی تەواوی جیهانەوە سەرقاڵە، نەک تەنیا بە چارەنووسی ئەورووپا و خۆرئاواوە.

گرینگیی "هانز کۆنگ" و زمان شیرینی ئەو لێرەوە سەرچاوە دەگرێت و کاتێکیش نووسینەکانی دەخوێنیتەوە، هەست دەکەیت خاوەنەکەی ڕێزی سەرجەم کولتوور و گەلان و ئاینەکانی دنیا دەگرێت و بەیەک چاو سەیریان دەکات. ئەم هەڵوێستەشی جیاوازە لە هەڵوێستی ئەو لووتبەرزانەی، ئیرۆسەنتەریزمانە بیر دەکەنەوە و لەوێشەوە بە شێوەیەکی دۆنییانە لە کولتوورەکانی تر دەڕوانن. لەبەرئەوە پێم باش بوو لێرەدا بۆچوونەکانی "هانز کۆنگ" بخەمە ڕوو، تا خوێنەرانی ئێمە ئاشنا بن پێی و لە ڕێی ئەویشەوە شارەزای کەموکوڕییەکانی مۆدێرنە بن و بزانن چۆن چۆنی ئەو پرۆسەیە بە قۆناغی پۆست مۆدێرنە گەیشتووە. ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنێ

کە من سەرلەبەر تەبەنی بیر و بۆچوونەکانی "هانز کۆنگ" دەکەم، چونکە رەنگە تا ئێستا و سەرەرای هەوڵی زۆریشی بۆ نوێکردنەوە، بەلام هەر تێروانینێکی تەقلیدییانەی بۆ ئاین هەبێت.

سەرباری ئەمانەش، وەلێ تیۆریاکەی ئەوە دەهێنێت گرینگی پێ بدرێت، لەبەرئەوەی لە پیاوێکی ئاینییەوە دێت کە دەیەوێت پێوەندی لەگەڵ زانستی نوێدا بەردەوام بێت و هەماهەنگییەک لەگەڵ مۆدێرنەدا دروست بکات، تا ئەو ئاستەی بیر و باوەڕی ئاینەکەی رێگەی پێ دەدات. هەروەها گرینگییەکی تریشی لەوەدایە کە پێویستە لەسەر ئەم مەسەلانە گوێبیستی تیۆلۆجیستەکانیش بین و تەنیا مافی قسەکردن، بە فەیلەسووفە ماتریالیستەکانی وەک: "هابرماس و ئالان تۆرین و فۆکۆ و.. هتد" رەوا نەبینین.

پێناسەکردنی مۆدێرنە.. "هانز کۆنگ" پێی وایە تێرمی Moderne کۆنە، بەلام بە مانا ئیجابییەکەی تەنیا لە سەرەتاکانی سەردەمی رۆشنگەریدا نەبێت بەکار نەهێنراوە. لەو قۆناغەدا وەکو نارەزاییەک دژ بە تێروانینی بازنەیی بۆ مێژوو بەکارهێنرا، ئەم تێروانینە بەشێوەیەکی بازنەیی سەیری سەردەمانی یۆنانی و رۆمانی کۆنی دەکرد و پێی وابوو ئەوانە ترۆپکی شارستانییەتن، وەکو ئاشکراشە ئەمە تێروانینی سەردەمی رێنیسانسیش بوو. Re-naissance کە لە زمانە بیانییەکاندا بە مانای سەرلەنوێ ژیانەوە دێت، بۆ دواوەی دەروانی نەک بۆ پێشەوە.

نموونەی بەرز و بالای رێنیسانس شارستانییەتی گریک و رۆمانی بوو، بۆیە دەیویست سەرلەنوێ میراتی و کەلەپووری ئەوان زیندوو بکاتەوە. کەواتە رێنیسانس تێرمی مۆدێرنەی دانەهێناوە و بەکاری نەبردووە. ئەوەی تێرمی مۆدێرنەی بەکارهێناو رەواجی بۆ پەیدا کرد سەدەی حەڤدەمی فرەنسا بوو، چونکە تەنیا ئەم سەدەیە هەستی بە سەرکەوتن و بالادەستی

بەسەر یۆنان و ڕۆمانەکاندا کرد، ئەمەش دوای ئەو سەرکەوتنانەی زانست و فەلسەفەی نوێ لە ڕێی "کۆپەرنیکۆس و گالیلۆ و دیکارت"ەوە بەدەستیان هێنا. بەمجۆرە ململانێی نێوان کۆن و نوێ لەو کۆبوونەوە بەناوبانگەدا دەستی پێ کرد کە ئەکادیمیای فرەنسایی لە ساڵی ١٦٨٧ سازی دابوو. ئەم ململانێیەش بیست ساڵێکی خایاند! بەڵام ئەمڕۆ تێرمی مۆدێرن و مۆدێرنەش خەریکن کۆن دەبن، لەبەرئەوەی بەرمبەرە خەریکە تێرمی پۆست مۆدێرنە جێگای دەگرێتەوە. هەرچەندە ئەم تێرمە تا ئێستاش بە وردی دەستنیشان نەکراوە، وەکو لە دواتردا باسی لێ دەکەین. چەمکی Mod-ernite تەنیا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە و بەتایبەتیش لە ساڵی ١٨٤٩دا فۆرمەلە بوو. مەزەندەی ئەوەش دەکرێت "بۆدلێر"ی شاعیر یەکەمین کەس بوو بێت بەکاری هێنابێت، بەڵام لەو کاتەدا خەڵکی بە شتێکی دزێو و ناشیرینیان دەزانی.

هەرچی ئایدیای پێشکەوتنیشە، ئەوا بە یەکێک لە ئایدیا عەلمانییە تایبەتەکانی سەردەمی نوێ دادەنرێت و لەگەڵ دەرکەوتنی مۆدێرنەدا دەستی بە بڵاوبوونەوە کرد و بوو بە نموونەی باڵای سەرجەم مێژوو لە سەدەی هەژدەمدا کە سەدەی ڕۆشنگەرییە. بڕواهێنان بە پێشکەوتن لە سەدەی نۆزدەمدا کە سەدەی گەشەکردنی زانست و پیشەسازی و تەکنۆلۆجیایە، گەیشتە ئەوپەڕی. بڕوابوون بە پێشکەوتن جێگای ئاینی مەسیحی گرتەوە و بەلای بیریارانی لیبراڵی و سوسیالیستییەوە بوو بە ئاینێکی نوێ. تا وای لێ هات تەواوی خەڵکانی ئەوروپا پشتیان بە زانست و پێشکەوتنی زانستی دەبەست بۆ چارەسەرکردنی کێشە مرۆڤایەتییەکان، بەڵام ئەم ئیمانە شێوە ئاینییە بە پێشکەوتنی زانستی لە دوو سەدە زیاتری نەخایاند و لەگەڵ هەڵایسانی یەکەم جەنگی جیهانیدا، گورزێکی کوشندەی بەرکەوت و دووەم گورزیشی لەگەڵ جەنگی دووەمی جیهانیدا خوارد. لەبەرئەوە "هانز کۆنگ" مێژووی پاش مۆدێرنە لە ساڵی ١٩١٨ (واتە مێژووی کۆتایی جەنگی یەکەمی

جیهانی) دەنووسێتەوە. ئەو پێی وایە مۆدێرنە لەو کاتەوە کۆتایی هاتووە و بێ ئەوەی بە خۆمان بزانین، پێمان ناوەتە سەردەمی پۆست مۆدێرنەوە (لێرەدا مەبەستی لە شارستانییەتی خۆرئاوایە).

زۆر کەس پێیان سەیر بوو چۆن نەتەوەگەلێکی شارستانیی وەک ئەوروپاییەکان، بەو دڕندەییە چوون بەگژ یەکتریدا و کەوتنە وێرانکردنی یەکتری. لێرەوە و بۆ یەکەم جار خەڵکی کەوتنە سەرکۆنەکردنی چەمکی مۆدێرنە و پێشکەوتن و گومان دەربڕین بەرامبەری، چونکە پێشبینی ئەوە دەکرا لەگەڵ تەشەنەسەندنی ڕۆشنگەریی فیکری و کۆتاییهاتنی ڕۆژگاری بەربەرییەت و دڕندایەتی سەدەکانی ناوەڕاست شەڕ و کوشتار نەمێنێت، بەڵام وا دەرنەچوو. خەسڵەتی دیاری سەردەمی مۆدێرنە، بریتی بوو لە: "باڵادەستی ئەقڵ بەسەر ئیمان و فەلسەفە بەسەر تیۆلۆجیا و عەلمانییەت بەسەر کڵێسادا". بەمجۆرە ئاین لە ژیانی گشتیدا کاڵ بووەوە و تەنیا بوو بە مەسەلەیەکی شەخسی و تایبەت. لەبەرئەوەی کڵێسای مەسیحی هەڵوێستێکی کۆنەپارێز و دواکەوتووانەی لە بیر و باوەڕی مۆدێرنە و پێشکەوتن وەرگرتبوو، بۆیە کەوتە بەر شاڵاوێکی توند و زەبری کوشندەی بەرکەوت.

"هانز کۆنگ" دان بەوەدا دەنێت کە کاردانەوەی سەردەمی ڕۆشنگەری لە بەرامبەر دەمارگیریی مەسیحی، کارێکی پێویست و ڕەوا بوو. هەر ئەمەش تیۆلۆجیستە مەسیحییەکانی ناچار کرد دەست بە نوێکردنەوەی کەلەپوور و ئاینەکەیان بکەن و تیۆلۆجیایەکی لیبراڵی بهێننە ئارا کە لەگەڵ سەردەمی زانست و پێشکەوتندا بگونجێت، گەر ئەمە نەبوایە ئەوروپا تا ئێستاش گیرۆدەی دەستی تیۆلۆجیایەکی تەقلیدیی سەدەکانی ناوەڕاست دەبوو. بەڵام کێشە و گرفتی مۆدێرنە لەوەدایە بەجۆرێک کەوتە دژایەتیکردنی فێندەمێنتالیزمی مەسیحی و دەمارگیری ئاینی، هێندەی نەمابوو خودی ئاین خۆیشی پاکتاو بکات! کەموکوڕیی گەورەی مۆدێرنەش سەرەڕای

دەسکەوتە زۆر و زەوەندەکـانی، لێـرەدایە. هەر بۆیە زۆر لە کـۆمـەڵگە ئەوروپاییە پێشکەوتووەکان کەوتنە خۆ، بۆ دەسکاریکردنی ئەو مەسەلەیە و گۆڕینی هەڵوێستی خۆیان بەرامبەر بە ئاینی مەسیحی.

شـایەنی باسـە زۆربەی ڕۆشنبـیـران پێـیـان وابـوو، کـێـشـەی ئاین لە سەردەمی مۆدێرنە و ڕۆشنگەریدا یەکلایی کراوەتەوە. کورتبینیی مۆدێرنەش لێرەدایە. لەگەڵ پایانی قۆناغی مۆدێرنەدا سەرەتای قۆناغێکی تازەتر دەست پێ دەکات، ئەویش قۆناغی پۆست مۆدێرنەیە. چۆن بتوانین لە تێرمی پۆست مـۆدێرنە بگەین و چۆنچـۆنیش دەکرێت بە وردی دەسـتنیشـانی بکەین، لە کاتێکدا تائێستاش چەمکێکی ئاڵۆز و نادیارە؟

دەتوانـین بڵـێین چەمکی پۆست مـۆدێرن لـەسـەر دەسـتـی فـەیلەسـووفی فرەنسایی "ژان فرانسوا لیوتارد" هاتە ئارا، کاتێک لە سـاڵی ١٩٧٩ کتێبی "هەلومەرجی پۆست مۆدێرن"ی نووسی. بـەڵام "هانز کۆنگ" پێی وایە قۆناغی پۆست مـۆدێرن زۆر پێش ئەو ماوەیە دەکەوێت و لە سـاڵی ١٩١٨ دەست پێ دەکات، واتە ڕاستـەوخۆ پاش کۆتاییـهاتنی جەنگی جیهانی یەکەم. "کۆنگ" چەمکی پۆست مۆدێرن بە مـەبەستی وێرانکردنی مۆدێرنە بەکارناهێنێت، تاوەکـو مـوحـافـیـزکـارە نوێیـەکـان و نیـهلیـسـتـیـیـەکـان بڵـێت: «مـۆدێرنە سـەرلەبەری نەهامـەتی و وێرانـە بوو". مـوحـافـیـزکـارەکـانی وەک کـاردینـاڵ "ڕاتزنجیر" کە بەرپرسی کاروباری ئیمانداریيە لە ڤاتیکان، ستایشی پۆست مـۆدێرنە دەکـەن. بەڵام بـۆچی؟ لەبەرئـەوەی وەکـو ئەوان مـەزەنـدەی دەکـەن، پۆست مـۆدێرنە لە دەست مـۆدێرنە قـوتاریان دەکـات و بەمـجـۆرەش دەتوانن بگەڕێنەوە سـەر بیـروباوەڕی سـەدەکانـی ناوەڕاست. هەرچی نیـهلیسـتی و ئانارشـیـزمـەکانی وەک "فـۆکـۆ و دێریدا و لیـوتارد"یشـە، پێشـوازی لە پۆست مــۆدێرنە دەکــەن، بەڵام لـەبەر هـۆیەکی تـر، ئەویـش ئەوەیـە کــە لـە کــۆت و بەندەکانی مۆدێرنە جاڕس بوون و دەیانەوێت ئەوروپا مەرکەزی لێک شیتاڵ بکەن. لەم سـەروبـەندەشــدا "هـانز کـۆنگ" دەیەوێت، "یۆرگن هـابرمـاس"ی

هاووڵاتی خۆی دڵنیا بکاتەوە، کە ئێستا بە مەزنترین فەیلەسووفی ئەڵمانیا و تەواوی خۆرئاوا دادەنرێت.

وەک ئاشکرایە ساڵی ١٩٨٠ "هابرماس" وتارێکی بەناوبانگی لەژێر سەردێڕی "مۆدێرنە پرۆژەیەکی ناتەواوە" بڵاو کردەوە و تێیدا شاڵاوی کردە سەر لایەنگرانی پۆست مۆدێرنە، بەو پێیەی ئەوانە دەیانەوێت تەواوی دەسکەوتە ئیجابییەکانی مۆدێرنە کە لە ماوەی دوو سەد ساڵی ڕابردوودا بەدەست هاتووە لەناوبەرن. "هابرماس" پێی وابوو ڕاستیی توندڕۆ لەگەڵ چەپی توندڕۆدا، هاوهەڵوێستن لە دژایەتیکردنی مۆدێرنە و نابووتکردنی دەسکەوتەکانیدا. وتاری "مۆدێرنە پرۆژەیەکی ناتەواوە"، هەڵلایەکی گەورەی لە ناوەندەکانی پاریسدا نایەوە و "فۆکۆ و دێریدا" و هاوڕێکانیانی زۆر تووڕە کرد.

"هابرماس" دان بەوەدا دەنێت مۆدێرنە گەیشتووەتە بنبەست، ئەم بنبەستەشی بە تاریکستانی نوێ ناوزەد کرد.. هەروەها پێی وایە ئەمە قۆناغێکە پێشبینیکردنی زەحمەتە، چونکە زیاد لە پێویست تاریک و ئەنگوستە چاوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زیاد لە ئەگەرێکی لە بەردەمدایە. "هانز کۆنگ" بۆ ئەوەی "هابرماس"ی هاوڕێی دڵنیا بکاتەوە، پێی دەڵێت: «من نامەوێت وەک هەندێک داخ لە دڵ و دەمارگیری کۆنەپەرست، دەسکەوتە گرینگەکانی مۆدێرنە فەرامۆش بکەم، بەڵام ناشتوانم لەمڕۆ بەدواوە مەسەلەی ئاین وەکو بیریارانی مۆدێرنە - هایدگەر، پۆپەر، دێریدا، فۆکۆ- وەلاوە بنێم».

ڕاستە مۆدێرنە لە ڕێی وەدەرنانی لە گۆڕەپانەکە چارەسەری کێشەی ئاینی کرد، بەڵام ئەمە چارەسەرێکی نێگەتیڤانەیە و ناکرێت بۆ ئەبەد بەردەوام بێت. زوو بێت یان درەنگ پێویستە سەرلەنوێ ئاین بگەڕێنینەوە بۆ ناو کۆمەڵگە ئەوروپاییەکان، بەڵام بێگومان بە مۆدێله دەمارگیرییەکەی

سەدەکانی ناوەڕاست نا، بگرە بەشێوازی پۆست مۆدێرنانە. ئاین شایستەی ئەوەیە وەکو سیاسەت و هونەر و کۆمەڵگە، بەشێوەیەکی جدی تاوتوێ بکرێت. ئەم هەموو سووکایەتیکردنە بە ئاین لە سەردەمی مۆدێرنەدا بۆچی؟ بۆچی بیریارانی خۆرئاوا ڕێزی ئاین ناگرن و بە شانازییەوە باس لە بێ باوەڕیی خۆیان دەکەن؟

"هانز کۆنگ" پێی وایە ئیعتبار گێڕانەوە بۆ ئاین پاش ئەوەی بۆ ماوەی دوو سەدە فەرامۆش کرا، لە توانایدایە شارستانییەتی خۆرئاوا لەو تەڵەزگەیە دەربهێنێت کە تێی کەوتووە، لێرەشەوە سەرەتاکانی سەردەمی پۆست مۆدێرن دەست پێ دەکات. قەیرانی ئاینی، سەرچاوەی ئەو قەیرانە ڕۆحی و فیکرییە گشتییەیە کە خۆرئاوا لە جەنگی جیهانی یەکەمەوە بە دەستییەوە گیرۆدەیە. ئێمە گەر دەستنیشانی قەیرانی ئاینی نەکەین و نەتوانین زاڵ بین بەسەریدا، ئەوا لە توانامانددا نابێت دەستنیشانی ئەو قەیرانە گشتییە بکەین ساڵەهایە خۆرئاوا تێی کەوتووە. ئەو قەیرانەی ئێستا بەر لە هەر شتێکی تر، قەیرانێکی ڕۆحی و ئەخلاقییە.

لە پای هەموو ئەم داکۆکیکردنانە لە ئاین، تۆ بڵێی "هانز کۆنگ" ترسی لەوە نەبێت بە کۆنەپەرست و کۆنسێرڤاتیف تاوانبار بکرێت، بەڵام ئەو لە وەڵامدا دەستبەجێ دەڵێت: «من هەرگیز نامەوێت بکەومە بەرەی دژ بە مۆدێرنە و ڕۆشنگەری، بەرەیەک کە لە ساتەوەختی ئێستادا لەلایەن کڵێسا و هەندێ شوێنی ترەوە پاڵپشتی لێ دەکرێت». ئەگەر فەیلەسووفانی مۆدێرنەی وەک:"فیورباخ و مارکس و نیچە و فرۆید"، لە ڕێی ڕاگەیاندنی "مەرگی یەزدان"ەوە تۆڵەیان لە ئاین کردبێتەوە، ئەوا "کۆنگ" نایەوێت بە ئیعلانکردنی "مەرگی مۆدێرنە" تۆڵەیان لێ بکاتەوە. ئەو پێی وایە لە مۆدێرنەدا خێر و چاکەی زۆر هەیە و پێویستە ڕێزی لێ بگرین. سەرجەم پێشکەوتنە زانستی و پزیشکییەکان و کەمکردنەوەی ئازارەکانی مرۆڤ، لەسەردەمی مۆدێرنەدا ڕوویان داو پێویستە ئەوەمان لە یاد نەچێت، بەڵام لە

پاڵ ئەوەشدا دەبێت دان بەوەدا بنێین کە مۆدێرنە گەیشتووەتە بنبەست. ئەمەش مانای ئەوە نییە ئێمە شالاو دەکەینە سەر مۆدێرنە و لە بەهای ئەو کەم دەکەینەوە.

"هانز کۆنگ" بانگەوازێک ئاراستەی چەپی رەخنەگر و ڕاستی پۆزەتیڤیستی دەکات و پێیان دەڵێت: «بزانن جارِدانی مەرگی ئاین لە سەردەمی مۆدێرنە و لەسەر دەستی کەسانی وەک فیورباخ و مارکس و نیچە ڕووی نەدا و، ئەوەتا ئاین تا ئەمڕۆش لەناو جەرگەی کۆمەڵگە پێشکەوتووەکانی ئەوروپادا ئامادەگی هەیە». ئەو پێی وایە پاش ئەوەی ئاقارە بێ باوەڕییەکانی پەنجاکان و شەستەکان و حەفتاکان هاتن و چوون، لە ئێستادا بیریارانی خۆرئاوا هەست بە پێداویستی شتێکی تر دەکەن. لەم قۆناغە ناهەموارەی تەڵەزگەی مۆدێرنەی خۆرئاواشدا، کێشەکە تەنیا لە "لە یادکردنی کەینوونە"دا نییە وەکی "هایدگەر" باسی دەکات، بگرە لە "لە یادکردنی یەزدان"یشدایە.. مرۆڤی تاک ڕەهەندیش بە وتەی "هربرت مارکۆزە"، توانای ئەوەی نییە بەخۆی بالاڕۆیی دروست بکات. ئومێد لە حاڵەتی نەمانی مانای ڕەهادا دروست نابێت و مۆدێرنەش نەیتوانی مانای ڕەها دەستەبەر بکات، تەنیا ئاین "ئەگەر بە شێوەیەکی راست و دروست تێی بگەین" توانای ئەوەی هەیە.

مرۆڤی هاوچەرخی ئەوروپایی کە لەسەر لێواری عەدەمیەت و پووچگەراییدا دەژی، تەنیا دوو ڕێگەی لەبەردەمدایە، یان وەکی فریادڕەسێک چاوەڕوانی یەزدان بکات یاخود دەبێت لە "چاوەڕوانی گۆدۆ"دا بێت، وەک "ساموئێل بیکێت" باسی دەکات. بۆچی ئاقاری نیهلستی لە بوارەکانی فیکر و شانۆ و ئەدەبی مۆدێرندا، تەشەنەیان سەند؟ لەبەرئەوەی مرۆڤی ئەوروپایی باوەڕی لەدەست دا و ناشزانێت چۆنچۆنی بگەڕێتەوە سەری قەیرانی ڕاستەقینەی مۆدێرنەش لێرەدایە. کەسە ژیر و داناکانی خۆرئاواش، هەنووکە دان بەو ڕاستییەدا دەنێن و پێت دەڵێن: «ڕاستە شارستانییەتی

خۆرئاوا لەسەر ئاستی تەکنۆلۆجی و زانستی و پیشەسازی پێشکەوتنی زۆری بەدەست هێنا، بەڵام هەمان پێشکەوتنی لەسەر ئاستی ئەخلاقی و رووحی بەخۆیەوە نەبینی». تێکچوونی هاوسەنگیی ئەم شارستانیيەتەش لێرەدایە. نموونەش ئەو هەڵپە و چاوچنۆکییەیەتی، بۆ دەست بەسەراگرتنی تەواوی بازاڕەکانی دنیا و بازاڕی ئەو وڵاتە هەژارانەشی بە دەست برسیەتییەوە دەناڵێنن.

لێرە بەدواوە ئەم پرسیارە دەخەینە روو: سیما و خەسڵەتەکانی جیهانی (پۆست مۆدێرن) کامانەن کە "هانز کۆنگ" بانگەشەی بۆ دەکات؟ "کۆنگ" پێی وایە قۆناغی پۆست مۆدێرن نابێت تەنیا بریتیی بێت لە کودەتاکردن بەسەر مۆدێرنە و رۆشنگەریدا و گەڕانەوە بێت بۆ دواوە، وەکو کۆنسێرڤاتیف و کۆنەپەرستەکان خەونی پێوە دەبینن.. ئەو نەدەیەوێت ستایشی مۆدێرنە بکات و نەدەشیەوێت سەرکۆنەی بکات، بگرە داوا دەکات مۆدێرنە بژار بکرێت بۆ ئەوەی چاک لە خراپ و لایەنی سلبی لە لایەنە ئیجابییەکانی جیا بکاتەوە. تەنانەت ئەو لەگەڵ "هابرماس"دا ناکۆکە لەسەر ئەوەی بە هەمان شێوەی جاران درێژە بە مۆدێرنە بدرێت، لەبەرئەوەی "هابرماس" وتەنی "پرۆژەیەکی ناتەواوە"، بگرە "هانز کۆنگ" پێی وایە مۆدێرنە پرۆژەیەکە پیر بووە و گەیشتووەتە بنبەست، ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە لە رێی ئەم سێ قۆناغەی لای خوارەوە تێی بپەڕێنین:

١- پێویستە خۆمان بەو رۆحە رەخنەییيەی سەردەمی رۆشنگەری چەکدار بکەین، بۆ ئەوەی لە هەموو دەمارگیرییەکی ئایدیۆلۆجی و ئسووڵی (سەرچاوەکەیان هەرچییەک بێت)، خۆمان بپارێزین.

٢- پێویستە دژایەتی ئەو ئاراستە تاک رەهەندییە مادییەی مۆدێرنە بکەین کە لایەنی رووحی و ئاینی فەرامۆش کردبوو. ئەمەش خەسڵەتی مۆدێرنەی پۆزەتفستی بوو کە لە سەدەی نۆزدە و بیستدا باڵادەست بوو.

سەردەمی پۆست مۆدێرن خوازیاری ئەوەیە سەرلەنوێ بگەڕێتەوە لای ئیمانداری. ڕاستە ئەقڵ و زانست و پێشکەوتن مەسەلەگەلێکی گرینگ و پێویستن، بەڵام بە تەنیا بەس نین و پێویستە ڕەهەندی ڕۆحی و ئیمانیشیان سەربار بخەین.

٣- پاش ئەوەی مۆدێرنە جێ دێڵین و پێ دەنێینە قۆناغی پۆست مۆدێرن، دەتوانین بەشێوەیەکی گشتگیر سەیری واقیع بکەین و لایەنە ڕۆحی و مادییەکانی پێکەوە ببینین.

"هانز کۆنگ" لەوە زویرە "هابرماس" وەک دوایین گەورە نوێنەری قوتابخانەی فرانکفۆرت، شوێن پێی "هۆرکهایمەر"ی مامۆستای هەڵنەگرتووە کە یەکێکە لە دامەزرێنەرانی ئەو قوتابخانەیە و ڕەهەندی ڕۆحی بە گرینگییەکی زۆرەوە تەماشا دەکرد.

ئیمانداری لە سەردەمی پۆست مۆدێرندا، ئیمانداریيەکی نوێیە و دوورە لە هەموو دەمارگیری و داخرانێک. بۆیە گەڕانەوەی ئەمجارە بۆ لای بیر و باوەڕی ئاینی مایەی ترس و نیگەرانی نییە و "هانز کونگ"یش داوای گەڕانەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست ناکات و ناشیەوێت دەستبەرداری دەسکەوتە سەرەکییەکانی مۆدێرنە و ڕۆشنگەری ببین. کارێک کە "کۆنگ" پێیەوە سەرقاڵە، لێک نزیککردنەوەی نێوان هەموو ئاینە مەزنەکانی مرۆڤایەتییسە، چونکە هەموو ئەو ئاینانە خاوەن پەیامێکی ڕۆحیی بەرزن و پێویستە هەر کەسە و لای خۆیەوە دان بەوەدا بنێت بەهای بەرز و بەنرخ تەنیا لەو بیر و باوەڕەدا نییە کە خۆمان باوەڕمان پێیەتی، بگرە لە ئاینەکانی تریشدا هەیە. بەمجۆرە لە ڕەوتی داخران و دەمارگیری قوتارمان دەبێت و ئاشتیی ئاینی لە نێوان بیر و باوەڕە جیا جیاکاندا بەرقەرار دەبێت. ئاخۆ دەشێت ئاشتیی ئاینی لە نێوان ئینسانەکاندا بەرقەرار بێت و ئەوەش بکرێتە سەرەتایەک بۆ هێنانە ئارای ئاشتیی سەربازی و سیاسی لە

سەرتاسەری جیهاندا؟

ئەمە ئەو شتەیە "هانز کۆنگ" خەونی پێوە دەبینێت و تەواوی توانای خۆی بۆ خستووەتە کار. ڕەنگە گەر لە پای هەلومەرجی ئەمڕۆی دنیادا سەیری ئەو خەون و خواستەی "کۆنگ" بکەین، زۆر یۆتۆپییانە بێتە بەرچاو. بەلام کێ چوزانێ؟ خۆ هەموو پرۆژەکان بە خەونی یۆتۆپییانە دەستیان پێ کردووە.

## ئەدمۆند هۆسێرل و جەوهەری شارستانییەتی خۆرئاوا

لە دواین ڕاپرسیدا کە پەیمانگەی ڕای گشتی لە مۆسکۆ پێی هەستابوو، دەرکەوت کە ٥٩٪ ی خەڵکی ڕووسیا خوازیارن وڵاتەکەیان ببێتە ئەندامی یەکەتی ئەورووپا و تەنیا ١٩٪ خەڵکی ئەو وڵاتە لەگەڵ ئەوەدا نین. تۆ بڵێی ئەمجارە ڕووسیا هەڵوێستی ناجێگیر و ڕاڕایی خۆی یەکلایی کردبێتەوە کە چەندین سەدەیە، لە نێوان ئینتیماکردن بۆ ئاسیا و ئینتیماکردن بۆ ئەورووپادا تێیدا ماوە؟ ئایا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت دوای سێ سەدە "پەترۆسی مەزن" ڕابەری نوێکردنەوەی ڕووسیا، لە هەوڵەکەیدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە؟

جگە لە ڕووسیا لە بەراییەکانی سەدەی بیست و یەکدا نەتەوەی گەورەی تری وەک چین و هندستان و... هتد، دەبینین بەرەو مۆدێرنەی خۆرئاوایی هەنگاو دەنێن و خوازیارن، زۆرێک لە بەها ئابووری و سیاسی و تەنانەت فیکرییەکانی شارستانییەتی ئەورووپایی پەیڕەو بکەن. لەم سەروبەندەدا دەپرسین: (دەبێت نهێنی سیحر و ئەفسوونی ئەم شارستانییەتە لە کوێدا بێت؟ چۆن شارستانییەتێکی وا بوو بە بەهەشتی سەر ڕووی زەمین، بەهەشتێک تەواوی میللەتانی دنیا ئارەزووی ئەوە دەکەن پێی تێ بنێن، بەڵام بێ ئەوەی لەو هەوڵەیاندا سەرکەوتوو بن؟

فەیلەسووفی ئەڵمانی "ئەدمۆند هۆسێرل" مامۆستای "مارتن هایدگەر" و یەکێک لە فەیلەسووفە گەورەکانی سەدەی بیستەم، پێی وایە سەرجەم دانیشتوانی ئەورووپا بە هەموویان و سەرەڕای بوونی نەتەوەی جیاجیا و سەرەڕای شەڕ و کێشە ناوەخۆییەکانیان یەک خێزان پێک دەهێنن. ئەورووپاییەکان بە هەموویان جۆرێک لە نیشتمانێکی ڕۆحی دروست دەکەن

کە بەرز و باڵاترە لە سەرجەم کولتوورەکانی تر، تەنانەت لە کولتووره دێرینەکانی وەک هند و چینیش لە بەرترە. ئەم باڵا دەستییەش لەسەر چ بنەمایەک دروست دەبێت؟ ئەڵبەتە لەسەر بنەمای داهێنانی ئەم سێ شتەی لای خوارەوە:

- ئەقڵ.
- زانست.
- فەلسەفە.

کەی ئەم داهێنانە کرا و زێدی ئەورووپای ڕۆحیش کوێیە؟

"هۆسێرل" لە وەڵامدا دەڵێت: «زێدی ڕۆحی ئەورووپا یۆنانە و هەر لە یۆنانی کۆنیشدا و لە ماوەی نێوان سەدەی حەوتەم و پێنجەمی پ.ز - ئەمەش ئەو ماوەیەیە کە سەردەمی بووژاندنەوەی فەلسەفە بوو لەسەر دەستی سوکرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆ و.. هتد، ئەو داهێنانە ئەنجام درا». لەو ساتەوەختەدا شتێکی ترسناک لە مێژوودا ڕووی دا و بۆ یەکەمین جار، هەڵوێستێکی فەلسەفیی ئازاد فۆرمەلە بوو. بەو مانایەی فیکر بوو بە پرسیارێکی ئازاد و کراوە، لەبارەی جیهان و سروشت و کۆمەڵگە و ئاین و سیاسەت. بەڵام چی وامان لێ دەکات بڵێین، فەلسەفە داهێنانی یۆنانییەکانە؟ ئایا فەلسەفەی ترمان نییە کۆنتر لە فەلسەفەی یۆنانی؟

ئەڵبەتە "هۆسێرل" ئینکاری لەوە ناکات و پێی وایە فەلسەفەی جۆراوجۆر لە خۆرهەڵاتی دووردا هەیە، وەکو فەلسەفەی هیندی و چینی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سوورە لەسەر ئەوەی بڵێت، فەلسەفەی یۆنانی کە دایکی فەلسەفەی نوێی ئەورووپاییە تەواو جیاوازە لە کۆی فەلسەفەکانی تری دنیا. بابزانین ئەم جیاوازییە لە کوێدایە؟ جیاوازییەکە لەوەدایە کە فەلسەفەی یۆنانی، بەتەواوەتی خۆی لە بیر و باوەڕە غەیبانییەکان جیا کردەوە و بوو بە بیرکردنەوەیەکی ئەقڵانیی پەتی. نهێنیی سەرکەوتنی ئەورووپا بەسەر

سەرجەم کولتوورەکانی تری جیهاندا لێرەدایە.

ڕاستە لە شارستانییەتەکانی تردا "فەلسەفە و زانست و ئەقڵ" هەبووە، بەڵام تەنیا لە ئەورووپادا ئەقڵ توانی هەموو پێوەندییەک لەگەڵ غەیبانییەت و ئەقڵی ئەفسانەییدا بپچڕێنێت. "فەلسەفە و ئەقڵ و زانست" نە لە هندستان و نە لە چین و نە لە هیچ جێگەیەکی دنیادا، نەیتوانی خۆی لە بیر و باوەڕە غەیبانییەکان جیا بکاتەوە. مرۆڤ لە بەرامبەر کۆمەڵگە و جیهاندا، دوو هەڵوێست وەردەگرێت:

یەکەم: سروشتی و عەمەلی و ڕاستەوخۆیە و ئەو هەڵوێستەیە کە هەموومان لە ژیانی ڕۆژانەماندا وەری دەگرین، بێ ئەوەی بیری لێ بکەینەوە. ئەم هەڵوێستەش لەژێر کاریگەریی ئەو بیر و باوەڕ و پەروەردەکردنەدایە کە لە سەردەمی منداڵییەوە بۆمان ماوەتەوە. ئەمەش هەڵوێستێکی نا ڕەخنەیی یاخۆ بەر لە ڕەخنەیە.

دووەم: شتەکان بەشێوەیەکی بابەتی دەبینێت و ئەمەش ئەوەیە پێی دەڵێین هەڵوێستی فەلسەفی. بێگومان گەیشتن بەمە پرۆسەیەکی هێندە سووک و ئاسان نییە. ئێمە کاتێک دەتوانین بەشێوەیەکی فەلسەفی بیر بکەینەوە، تەواوی ئەو شتانەمان لە خۆمان داماڵیبێت کە لە منداڵییەوە پێی ڕاهاتووین. ئەمەش پرۆسەیەکی قورس و تاقەت پرووکێنە، هەر لەبەرئەمەیە فەلسەفە و فەیلەسووف لە مێژوودا دەگمەنن. بۆ ئەوەی بفەلسەفێنی و ببیتە فەیلەسووف، پێویستە خواست و ئارەزووەکانت تێپەڕێنی و بەسەر ئەو ئینتیمایانەدا زاڵ بیت کە لە ناختدا ڕۆچوون. کێ دەتوانێت بەم مەرجانەوە ببێتە فەیلەسووف؟ ئەڵبەتە کەسانی وەک: "ئەفلاتۆن، ئەرستۆ، دیکارت، کانت، هیگڵ، نیچە". کێ دەتوانێت لە خۆی جیا ببێتەوە، بۆ ئەوەی ببێتە فەیلەسووف؟ ئەی ئەگەر جیا بووەوە کێ دەڵێت دوای ئەو سەفەرە ترسناک و سەرکێشییانە، بێوەی دەگەڕێتەوە شوێن و جێی خۆی؟ خەڵکانێک هەن ڕێ

نابرِن و بەلادا دێن، یان هەندێک دەبنە دێوانە یاخۆ خۆیان دەکوژن یان بە ئاگری هەقیقەت دەسووتێن. تەنیا کەسێک شایستەی نازناوی فەیلەسووفە کە سەرکێشی دەکات و بە ناخی خۆیدا ڕۆدەچێت و لەو سەریشەوە بێوەی دێتە دەرێ.

جیاوازییەکی زۆر لە نێوان تێڕوانینی فەلسەفی بۆ جیهان و ئەو بیر و بۆچوونە باوانەی ناو کۆمەڵگەدا هەیە بۆ دنیا، بەڵام تەنیا هەڵوێستی فەلسەفی دەتوانێت بەشێوەیەکی بابەتی لە دیاردەکان بڕوانێت و قسەیان لەسەر بکات. ئەو کەسەی نەتوانێت پانتاییەکی ڕەخنەیی لە نێوان خۆی و خودی خۆیدا بهێڵێتەوە و نەتوانێت لە خۆی جیا بێتەوە، ئەو کەسەی هەست بە ترس بکات و لە کاتی ئاشکرابوونی جەوهەری بیر و باوەڕە کۆنەکاندا هاوسەنگی لە دەست بدات، پێویستە قەرەی فەلسەفە نەکەوێت و لە جیهانی فەلسەفیدا سەرکێشی نەکات، چونکە کارێکی وا ماندووی دەکات و بەرەو دێوانەیی دەبات. بەڵام ئاخۆ ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە هەموو خەڵکانی ئەورووپا، دەتوانن هەڵوێستێکی لەو جۆرە وەربگرن؟ "هۆسێرل" لە وەڵامدا دەڵێت: نەخێر. تەنیا دەستەبژێرێکی کەم و دیاریکراو لە توێژەر و ئەکادیمی و پسپۆڕەکان، دەتوانن ڕووبەڕووی هەقیقەتی بابەتی شتەکان و دیاردەکان ببنەوە. حەقیقەتی بابەتیش بەرهەمی زانست و فەلسەفەیە.

بەر لەمەش تەنیا هەقیقەتی لاوەکی لە ئارادا بووە کە تایبەت بووە بەم یان بەو کولتوور. هەرچی هەقیقەتی زانستی فیزیاشە، ئەوا حەقیقەتێکی یۆنیڤێرسالییە و یاساکانی لە تەواوی زانکۆکانی جیهان بەیەک شێوە دەخوێنرێت. شتێک نییە ناوی فیزیای ژاپۆنی یان ئەورووپایی یان عەرەبی بێت، بگرە ئەوەی هەیە فیزیایەکی گەردوونییە. کەواتە گەر کەلەپووری ئاینی مرۆڤایەتی بەش بەش بکات، ئەوا کەلەپووی فەلسەفەی ئەقڵانی یەکیان دەخات. بەڵام لێرەدا پێویستە ئێستێک بکەین. ئەگەر گەردوونگەرایی زانست و تەکنۆلۆجیا شتێکی دیار و ئاشکرا بێت و کەس لاری لێی نەبێت،

ئایا دەکرێت هەمان شتیش لەبارەی فەلسەفەوە بڵێین؟

"هۆسێرل" پێی وایە دەکرێت هەمان شتیش لەبارەی فەلسەفەوە بڵێین، بەمەرجێک وەکو زانستێکی ورد و تۆکمە لە فەلسەفە تێ بگەین، نەک وەکو شتێکی ئەبستراکت و هەرزەگۆییەکی بەتاڵ. فەلسەفە لە ڕێگەی نوێکردنەوەی بەردەوامیی پرسیار و توێژینەوەکانییەوە، گەردوونیبوونی خۆی دەسەلمێنێ. هاوکات فەلسەفە بیر و بۆچوونە باوەکان و تێزە ئایدیۆلۆجەکان دەخاتە ژێر پرسیارەوە. ئەمەشە وا دەکات زۆرێک لە کولتوورەکان دژایەتی بکەن و ڕێگە نەدەن بە ئاسانی فەلسەفە بچێتە ناویانەوە. تەنیا ئەوروپا توانی تا دواسات، درێژە بە شەڕی فەلسەفە لەگەڵ کەلەپووری مەسیحیدا بدات و تەنیا ئەو توانی شەڕی حەقیقەت لەگەڵ خۆی و پیرۆزترین شتەکانی کولتووری ئەوروپاییدا بکات. لێرەوە ئەوروپا توانی لەیەک کاتدا بەسەر خۆی و تەواوی دنیاشدا زاڵ بێت. جەوهەری شارستانییەتی خۆرئاوا و نهێنیی بالادەستی لەسەر ئاستی جیهان، لێرەدایە.

ئەم هەڵوێستە مەعریفییە ئازادە لە هەموو کۆت و بەندێکی پێشوەخت، بە بۆچوونی "هۆسێرل" بۆ یەکەمین جار لە یۆناندا سەری هەڵدا. شارستانییەتی خۆرئاواش میراتگرێکی شەرعیی گریکەکانە. لەگەڵ "تالیس" و هاوڕێکانیدا هەڵوێستی ڕەخنەیی دێتە ئارا و فەلسەفە لەدایک دەبێت و سەردەمی سۆراخکردنی هەقیقەتی بابەتی دەست پێ دەکات، ئەمەش بۆ خۆی گەورەترین قەڵەمبازە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا. جگە لە کولتووری ئەوروپایی تا ئێستا هیچ کولتوورێکی تر بوێریی ئەوەندەی تێدا نەبووە قەڵەمبازێکی وا بدات. بۆیە وتم "تا ئێستا"، لەبەرئەوەی ئەم مەسەلەیە لە بەردەم کولتوورەکانی تری، وەک: "کولتووری ئیسلامی و هندۆسی و کۆنفۆشیۆسی و بوودیزم"دا ئاوەڵایە.

ئاشکرایە هەنووکـە لەناو هەمـوو ئەو کـولتـوورانەدا، ڕۆشنبـیـری ڕەخنەییمـان هەیە کە لە هەقیقەت دەگەڕێن و دەیانەوێت میتۆدی زانستی بەسەر کەلەپووری خۆیاندا پراکتیزە بکەن. بەڵام ئەوانە هێشتا کەمینەیەکن و لە پەراوێزدان. ئەڵبەتە ئەم کەمینەیە ئەگەری ئەوەی هەیە، بەهۆی هۆکارە ناوەخۆیی و دەرەکییەکانەوە و بە تایبەت هۆکاری بەجیهانیبوونەوە زیاد بکات.

"هۆسێرل" ئەم بیر و بۆچوونانەی لەو لێکچەرە بەناوبانگەدا خستە ڕوو کە ساڵی ١٩٣٥ لە ڤییەنا بە ناونیشانی "قەیرانی هیومانیزمی ئەوروپایی و فەلسەفە"، پێشکێشی کرد. وەک دەزانین ئینسانی ئەوروپایی لەو کاتەدا و بەهۆی هاتنە ئارای نازیزم و فاشیزم و بزاوتە نائەقڵانییەکانەوە، لە قەیرانێکی قووڵدا دەژیا و ئەوکات جەنگی دووەمی جیهانی بەڕێوە بوو. لەو فەزایەشدا کە پڕی بوو لە ئایدیۆلۆجیای فاشییانە و دەمارگیری و ئەفسانەی ئاری نەژاد، "هۆسێرل" کەوتە داکۆکیکردن لە ئەقڵانییەت. بەو پێیەی ئەقڵانییەت جەوهەر و نهێنیی شارستانییەتی خۆرئاوا پێک دێنێت. تەنانەت "هۆسێرل" داوای ئەقڵانییەتێکی یۆنیڤێرسالییانەتری دەکرد کە لە ئەقڵانییەتی ڕۆشنگەری بەرفراوانتر بێت. ئەو پێی وا بوو ئەقڵانییەتی ڕۆشنگەری بەرتەسک بووە و بووەتە جۆرێک لە فەلسەفەی پۆزەتڤستی وشک و برنگ. پۆزەتڤیزمیشی بە گەورەترین هەڕەشە دەزانی بۆ سەر شارستانییەتی ئەوروپایی. بەڵام بۆچی پۆزەتڤیزمی بەو مەترسییە دەزانی؟ لەبەرئەوەی پۆزەتڤیزم ئیعتراف بە ئایدیا باڵاکان و بەها ڕووحییەکان ناکات و هەموو شتێک کورت دەکاتەوە بۆ مادەیەکی ڕووت.

شلۆقبوونی فەلسەفەی ڕۆشنگەری و دابەزینی بۆ ئەم ئاستە، ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی پڕۆژەی فەلسەفی و ئەقڵانی ئەوروپایی کە لە یۆنانەوە دەست پێ دەکات و تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوامە، لە قەیرانێکی قووڵدا دەژی. چارەسەری ئەم قەیرانەش بەوە دەبێت بگەڕێنەوە بۆ ئەقڵانییەت، نەوەک

بچینه ڕیزی ئەو ئاقاره نا ئەقلانییانەی "هتلەر" رەواجی پێ دەدا. بێگومان مێژوو گوێی بۆ "هۆسێرل" نەگرت، بگره گوێی بۆ "هتلەر" گرت. سەرەنجامیش بەوە گەیشت کە هەموومان دەزانین.. ڕاستە فەیلەسووف بۆ ماوەیەکی کورت ئەو شەڕەی دۆڕاند، بەڵام لەسەر ئاستی ماوە درێژ ئەو براوە بوو.

دوای کۆتاییهاتنی جەنگی دووەمی جیهانی، ئەوروپا لەو ئایدیۆلۆجیا مەرگدۆست و توندڕۆیانە دوورکەوتەوە کە وێرانیان کردو گەیاندیانە لێواری لەناوچوون. لەو مێژووە بە دواوە ئەوروپا هێدی هێدی و بە شێوەیەکی ئەقڵانی، کەوتە خۆ کۆکردنەوە و فەزایەکی فراوانی بۆ ئازادییە دیموکراسییەکان خوڵقان کە لە باشووری ئیسپانیاوە درێژ دەبێتەوە تا باکوری وڵاتانی ئەسکەندەنافیا. هەنووکە ئەوروپا بووەتە مێرگێکی پڕ لە ئارامی و گەشەکردن، ئەمەش وای کردووە ڕووسیا خەون بەوە ببینێت ببێتە ئەندام لە یەکەتیی ئەوروپادا. وا بۆ زیاتر لە نیو سەدە دەچێت ئەوروپا لە ئاشتییەکی سەرتاسەری و بەردەوامدا دەژی، ئەمە وامان لێ دەکات بڵێین پێشبینییەکەی "هۆسێرل" ڕاست دەرچوو کە دەیوت: «ئەقڵانییەتی فەلسەفی چاکترین ڕێگەچارەیە، بۆ چارەسەرکردنی کێشە و قەیرانەکان».

## سەرەتا دژوارەکانی مۆدێرنەی فرەنسایی

ڕۆشنگەریی لە فـرەنسـا چۆن هاتە ئارا و چۆن ئەو وڵاتە گـاف گـاف، لە ڕۆژگاری فـێندەمـێنتالـیزمی کـاتۆلیکی ڕەهاوە گـواستـیەوە بۆ سـەردەمی ئیمـانی ڕۆشنگەر و فـیکری ئەقـڵانی؟ هەندێک لە گـەورە مـێـژوونووسـانی هاوچەرخ پێـیـان وایە "فـۆنتنێل" (١٦٥٧-١٧٥٧)، یەکـەمـین کـەس بووە ستایشی سەردەمی ڕۆشنگەری کردووە.. متمانەی "فۆنتنێل" بە مرۆڤایەتی و داهاتووی ئینسان، دەگەڕایەوە بۆ ئەو پێشکەوتنانەی زانست لە سەردەمی ئەودا بە دەستی هێنابوو، بەتایبەت زانستی ماتماتیک و فیزیک. سەرەڕای گومان و بەدبینی، بەڵام خۆشحاڵیی خۆی بەو گۆڕانکارییانە نەدەشاردەوە کە بەسەر ژیانی ڕۆشنبیریی فرەنساییدا هاتبوو. بۆ نموونە لە جێگەیەکدا دەڵێت: «ماوەیەکی کەمە گیانێکی فەلسەفی زۆر نوێ لە وڵاتەکەماندا بڵاو بووەتەوە، ئەمەش بریتییە لە ڕۆشناییەک کە باوانمان دەرفەتی ئەوەیان بۆ نەڕەخسا لێی بەهرەمەند بن و سەرەنجام ئێمە پێی گەیشتین». هەروەها دەڵێت: «ئێمە درەوشاوەین بە ڕووناکی ئاینێکی ڕاستەقینە و بڕواشم بە هەندێک تیشکی فەلسەفەی ڕاستەقینە هەیە. هەنووکە ئێمە هەزاران جار لە خەڵکانی سەردەمانی پێشوو ڕۆشنترین، ئەو خەڵکانەی وەهم و خورافاتیان بەرهەم هێنا».

لێـرەدا سـەرنج دەدەین "فـۆنتنێل" هەسـتی کـردووە لە سـەردەمـێکی ڕۆشنگەردا دەژی، لانی کەم لە بواری فەلسەفەدا بەتایبەتی پاش "ڕینێیە دیکارت"، هەروەها لە بواری زانست و ڕەخنەی مـێـژوویـیدا. بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین تا سـاتەوەخـتی "فـۆنتنێل"، چەمکی ڕۆشنگەری هیچ

ڕەخنەیەکی لانی کەم بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ- ئاڕاستەی فیکری ئاینی نەکردبوو. شایەنی باسە "فۆنتنێل" بەشێوەیەکی سەرەکی لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەدا ژیا و دەستی بە نووسین کرد.

ئێمە دەزانین شەڕی نێوان ئەقڵانییەکان و پیاوانی ئاینی بەشێوەیەکی فیعلی تەنیا لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەمدا دەستی پێ کرد، بەتایبەت پاش ساڵی ١٧٦٠ کاتێک کتێبە سەرەکییەکانی "ڕۆسۆ" و "دیدرۆ" و "فۆلتێر" و "بارۆن دۆلباک" چاپ کران و بڵاو بوونەوە. ڕاستە چەمکی سەردەمی ڕۆشنگەری لە نیوەی یەکەمی سەدەی هەژدەمدا هەبوو، بەڵام تەنیا لە دوای نیوەی دووەمی ئەو سەدەیە بووە بنەما و دروشم. ئەمەش ناگەڕێتەوە بۆ هەندێک لەو ڕووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتییانەی لەو ماوەیەدا ڕوویان دا، بگرە دەگەڕێتەوە بۆ ڕووداوێکی فیکریی سەرەکی ئەویش بڵاوکردنەوەی ئینسیکلۆپیدیا بەناوبانگەکە بوو کە "دیدرۆ" (١٧١٣-١٧٨٤) سەرپەرشتی کرد. ئەم پرۆژە فیکرییە مەزنە تەواوی ڕۆشنگەرەکانی لە هەموو بوارەکاندا لە دەوری خۆی کۆکردەوە. بەیاننامەی سەرەتای ئینسیکلۆپیدیا کە "دیدرۆ" نووسیبووی، ساڵی ١٧٥٠ بڵاو بووەوە. هەرچی گوتاری پێشەکییە بە پێنووسی "دالامبێر" نووسرابوو، لە ساڵی ١٧٥١دا بڵاو کرایەوە.

ئینسیکلۆپیدیا بە هەموو بەشەکانییەوە، کۆکردنەوەی دەسکەوتەکانی ڕۆشنگەرییە کە لە ماوەی نیو سەدەی ڕابردوودا ڕوویان دابوو. واتە دەرەنجامی کۆتایی سەرجەم ئەو زانیاری و زانستانەیە کە لەو سەردەم و ڕۆژگارەدا لە ئارادا بوو. لە وتاری پێشەکیدا کە شایستەی لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتە، "دالامپێر" " ١٧١٧- ١٧٨٣" پێی وایە سەردەمی ڕێنیسانس یەکەمین چەرخی ڕۆشنگەرییە زەمینەسازی بۆ سەدەی هەژدەم کرد، بەم پێیە ئێمە قەرزارباری ئەو ڕۆژگارەین. پاشان دادگاکانی پشکنین لە سەدەی حەڤدەمدا و هەروەها ئاقاری کاتۆلیکی توندڕۆ و دژە ڕیفۆرمی ئاینی هاتنە ئارا، بەڵام نەیانتوانی ڕۆشنگەری خەفە بکەن کە سەرەتاکانی لە سەردەمی

ڕێنیسانسەوە بەدەرکەوتبوو.

مەشخەڵی ڕۆشنگەری سەرەڕای هەوڵی زۆری دەمارگیرەکان بۆ خەفەکردنی، هەر بەدرەوشاوەیی مایەوە. لە ئینسیکلۆپیدیادا چەمکی ڕۆشنگەری بە زۆری دێت. لە یەکێک لە وتارەکانیدا "دیدرۆ" جیاکارییەک دەکات لە نێوان سەردەمی ڕۆشنگەری و سەردەمی جەهل و تاریکیدا، لە جێگەیەکی تریشدا بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە کە ترسی ئەوەیان هەبوو مرۆڤی ئەوروپایی، دووچاری نووچدان بێت و جارێکی تر لە تاریکیدا ڕۆبچێت. لەمبارەیەوە دەڵێت: «پێویست بەم ترسە ناکات، هیچ کاتێک هێندەی ئەم سەردەمەی ئێمە تاریکی و نەزانی لە پاشەکشەدا نەبووە. فەلسەفەش هەنگاوی گەورە دەنێت و بەرەوپێش دەچێت، لەم پرۆسەیەشدا ڕۆشنگەری هاوشانیان لەگەڵیدا ڕێ دەکات». لە جێگەیەکی تردا "دیدرۆ" دەڵێت: «فەلسەفەی ڕاست و دروست کە ڕووناکیی خۆی بە هەموو جێگەیەکدا پەخش دەکات و لە هەموو شوێنێک دەدرەوشێتەوە، خەریکە زیاتر و زۆرتر دەچێتە دێر و کڵێساکانەوە».

لەلایەکی ترەوە "گریم" "١٧٢٣-١٨٠٧"، خاوەنی گۆواری "نامە گۆڕینەوەی ئەدەبی" و هاوڕێی "دیدرۆ" و "ڕۆسۆ" ستایشی ڕۆشنگەری دەکات، بەڵام لە گرووپی ئینسیکلۆپیدیا کەمتر گەشبینی پێوە دیارە. شایەنی باسە "گریم" بەچەند قۆناغێکدا ڕۆیشتووە. سەرەتا زۆر لەوان خوێنگەرمتر بوو، پێی وابوو هاوڕێکانی زیاد لە پێویست نەرم و شەرمن. ساڵی ١٧٥٥ ڕەخنەی ئاڕاستەی ئەو گوتارە کرد کە "دالامپێر" لە ئەکادیمیای فرەنسایی پێشکێشی کرد، کاتێک وەکی ئەندامێکی ئەکادیمیاکە پێشوازی لێ کرا، لەبەرئەوەی وەکی پێویست جەختی لە سەرکەوتنی ڕۆشنگەری نەکردبووەوە.

پێ دەچێت "دالامپێر" لە پەرچەکرداری کۆنسێرڤاتیفەکان ترسابێت، بە تایبەت ئەوان زۆرینەی ئەو دەزگا فرەنسایییە دێرینەیان پێک دەهێنا. لە

ڕەخنەکەیدا "گریم" نووسیبووی: "دەبوو باسی لە نەهامەتی سەردەمە تاریک و بەربەرییەکانی پێشوو بکردایە، سەردەمێک جەهل و نەزانی بەسەر ئەقڵییەتی مەسیحییەکاندا زاڵ بوو. هاوکات دەبوو باس لەو ڕووناکییە نەرمونیانەش بکات کە مرۆڤی ئەم سەردەمەی ڕووناک کردووەتەوە، مەبەستم لەوەش ڕووناکی فەلسەفە و زانستە". لە جێگەیەکی تردا باس لە ڕۆڵی پرۆتستانتەکان دەکات، لە بڵاوکردنەوەی تۆلێرانس و ڕۆشنگەری و بەگژاچوونەوەی دەمارگیریی ئاینی و مەزهەبی. لەژێر کاریگەریی ئەواندا ڕۆشنگەری هات بۆ ئەوەی دڕ بە تاریکییەکان بدات کەچی دواتر "گریم" سارد بووەوە و ئەو حەماسەتەی سەرەتای نەما. بەڵام داخۆ ماندوو بوو یان بێ ئومێد بوو لە دژایەتیکردنی دەمارگیری و دەمارگیرەکان؟ بۆ نموونەساڵی ١٧٥٧ دەڵێت: «جۆرە مرۆڤێک هەن زۆرینەن، ڕۆشنگەری فیکری هیچ کاریگەریان تێ ناکات و سوورن لەسەر کاڵفامی و دەمارگیریی خۆیان».

تەنانەت کار دەگاتە ئەوەی سەدەی هەژدەم، بەسەدەیەکی نا ڕۆشنگەری بداتە قەڵەم. بۆ نموونە دەرهەق بە یەسووعییەکان "دوژمنانی سەرسەختی فەیلەسووفان" دەڵێت: «بێگومان نەوەکانی تاریکی لە ڕووناکی دەترسن و ڕقیشیان لەوانەیە ڕووناکی لە نێو مرۆڤەکاندا بڵاو دەکەنەوە». لە جێگەیەکی تردا دەنووسێت: "ئەوانە یەکەمین ئامانجیان سڕینەوەی ڕۆشنگەری و زانستە لەسەر گۆی زەوی". بەڵام پاش ساڵی ١٧٦٥ شتێک لە ناخ و دەروونی "گریم"دا گۆڕا و وەکی پێشتر گەشبین نەما و نائومێد بوو، ئەمەش لەبەر ئەوە نەبوو کە گومانی لە ڕۆشنگەری هەبێت، بگرە لەبەر ئەوە بوو گومانی لە توانای مرۆڤ دەکرد لەوەی توانای تێگەیشتن و قبووڵکردنی ڕۆشنگەرییان هەبێت.

لەم بارەیەوە دەڵێت: «چرکەساتەکانی ڕۆشنگەری لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ئێجگار کورتن»، یاخود دەڵێت: «ڕۆشنگەریی گەلێک لە گەلان پەیوەستە بە ژمارەیەکی کەم یان دەستەبژێرێکی دیاریکراو، هەرچی زۆرینەشە ئەوا

ئەستەمە ڕۆشنگەر بکرێن». بەڵام بۆچی نائومێدی تەنگی پێ هەڵدەچنێ؟ لەبەرئەوەی ئەو ڕووداوە مەزهەبییانەی ئەو کات لە فەرەنسادا ڕووی دا ناهەموار بوو، بەڵگەی ئەوە بوو دەمارگیری لە ناخی مرۆڤەکاندایە و ئەستەمە ریشەکێش بکرێت. لەو ماوەیەدا کێشەی بنەماڵەی "کالاس" ڕووی دا، کە بنەماڵەیەکی پرۆتستانتی بوون و لە شاری تولۆز لەلایەن زۆرینەی کاتۆلیکییەکانەوە بەشێوەیەکی ترسناک سەرکوت کران. هاوکات کێشەگەلێکی تری وەک کێشەی "سیرڤین" و "لابار" و.. هتد، ڕووی دا.

ئەمانە مرۆڤگەلێک بوون بە تاوانی وازهێنان لە ئاینی مەسیحی یاخۆ پابەندنەبوون بە سرووت و ڕێوڕەسمە ئاینییەکان، سووتێنران یاخۆ کوژران. ئەم ڕووداوانە دەری خست زۆربەی گەلی فەرەنسایی تا ئەو کاتەش دوور بوون لە ڕۆشنگەری و ڕۆشنگەریش تەنیا تایبەت بوو بە دەستەبژێرێک لە فەیلەسووفان و ڕۆشنبیران. لێرەوە کار گەیشتە ئەوەی یەکێک لە دادوەرەکانی شاری تۆلۆز ستایشی سزادان بکات، بەو پێیەی ئامرازێکی لەبارە بۆ ناچارکردنی کەمینەی پرۆتستانتی تا دەستبەرداری ئاینزای خۆی بێت و باوەڕ بە ئاینزای زۆرینە بێنێت کە ئاینزای کاتۆلیکی بوو.

دەرهەق بەم بۆچوونە "گریم" شێتگیر بوو وتی: «نەوەکانی داهاتوو نەفرەتمان دەکەن و بە تۆمەتی بەربەرییەت و دڕندایەتی تاوانبارمان دەکەن، لە کاتێکدا ئێمە لافی ئەوە لێ دەدەین سەر بە ڕۆژگارێکی فەلسەفی ئەقڵانین»! بەڵام هەر دوای ئەمە لەو ڕەشبینییە پاشگەز بووەوە و گەڕایەوە سەر گەشبینیی سەرەتای و دەڵێت: «ئێمە لە باوکانمان چاکترین، ئەڵبەتە ڕۆڵەکانیشمان لە خۆمان چاکتر دەبن، لە ڕووی ڕۆشنگەری و دوورکەوتنەوە لە دەمارگیری»، بەڵام سەرلەنوێ و لە ساڵی ١٧٧٠ دووچاری ڕەشبینی دەبێتەوە! پێ دەچێت ئەمجارەیان ڕەشبینی بەری نەدابێت، چونکە ڕێگەی ڕۆشنگەری دوور و درێژە و پڕی کەند و کۆسپە و ئاکامیشی پێشوەخت مسۆگەر نییە، وەکی هەندێک مەزەنەیان دەکرد. لەبەرئەوەی تاریکخوازان لە

بۆ سەدان بۆ فیکری ئازاد و هەر کاتێک هەلیان بۆ بڕەخسێت، بەبیانووی دژایەتیکردنی ئیلحاد و بێ باوەڕییەوە یاخۆ بەرگریکردن لە بیر و باوەڕ "بیر و باوەڕی باو و باپیران"، دەست لە ڕۆشنگەری دەوەشێنن، بەم کارەشیان دژایەتی ئازادی فیکر و ویژدان دەکەن.

سەرومختێک یادی دووسەد ساڵەی قەسابخانە بەناوبانگەکەی "سانت بارتیلمی، ٢٤ی ئابی ١٧٧٢" کرایەوە، "گریم" دەنووسێت: "ئێمە هەموو ڕۆژێک شانازی بەو پێشکەوتنەوە دەکەین کە ڕۆحی فەلسەفی و ئەقڵانی لە وڵاتەکەماندا بەدەستی دێنێت، بەڵام ئەم پێشکەوتنە تا هەنووکەش هەموو چین و توێژەکانی نەگرتووەتەوە و تایبەتە بە دەستەبژێرێک لە بیریاران. دەبێت ئەوەش بڵێین تەنیا فێندەمێنتالیستەکان نەفرەت لە ڕۆشنگەری ناکەن، بگرە حکوومەتیش ترسی لێی هەیە و دەیەوێت پەکی بخات و کۆسپی بۆ دروست بکات". لە جێگەیەکی تردا کە تەعبیر لە نائومێدی و پەستیی ئەو دەکەن دەڵێت: «بەشێوەیەکی گشتی مرۆڤایەتی بۆ ئازادی و هەقیقەت نە خوڵقاون، ئەگەرچی بەردەوام باسیان لێ دەکەن، بەڵام لە ڕاستیدا ئازادی و هەقیقەت تەنیا بۆ ئەو دەستەبژێرەی مرۆڤ خوڵقاوە کە دەتوانێت بەهرەمەند بێت لێیان، بەمەرجێک زۆر خۆیی پێوە بانەدات. هەرچی مرۆڤەکانی ترە واتە زۆرینە، ئەوا تەنیا بۆ کۆیلایەتی و گومڕایی دروست بوون».

## دیکارت

فەیلەسووفی فەرەنسایی "ڕینێیە دیکارت"، کەسێکی بێ ئەندازە بەناوبانگە.. کێ هەیە ناوی "دیکارت"ی نەبیستبێت؟ ئەی ئەو دامەزرێنەری ئەقلانییەت نییە، تا ئەو ئاستەی لەگەڵ ئەقلانییەتدا تێکەڵ بووە؟ کاتێک بە شتێک دەڵێین دیکارتییە، ئەوە مانای وایە ئەو شتە ئەقلانییە. یان کاتێک دەڵێین فەرەنساییەکان دیکارتین، ئەمە بەو مانایە دێت کە ئەوان ئەقلانیین. ئەم فەیلەسووفە کاریگەری لەسەر تەواوی میللەتێک بەجێ هێشت، بەڕادەیەک ئەستەمە بتوانرێت جیاوازی لە نێوان کارەکتەری ئەو و میللەتی فەرەنساییدا بکرێت. ئەو خۆی بە تەنیا نەتەوەیەک بوو. تەنانەت ڕێکخستنی شەقام و گۆڕەپانە گشتییەکان لە فەرەنسادا، لە ڕووی وردەکاری و دیسپلینەوە هەمان خەسڵەتی میتۆدی دیکارتیان هەیە.

بەڵام کێ ئەوە دەزانێت کە "دیکارت" ترسی زۆری لە پیاوانی کڵێسا هەبووە و بە درێژایی تەمەنیشی خۆی لێ پاراستوون؟ "دیکارت" ڕێگەیەکی زۆری گرتەبەر تا خۆی لە بەڵای پیاوانی ئاینی بپارێزێت. لەبەر ئەوە فەرەنسای بەجێ هێشت کە لەو سەردەمەدا پڕی بوو لە فێندەمێنتالستی کاتۆلیکی، بۆ ئەوەی لە وڵاتێکی پرۆتستانتی لیبراڵی وەک هۆڵەندادا بژی، بەڵام تەنانەت لەوێشدا بەردەوام شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی دەگۆڕی و تاڕادەیەکی زۆریش خۆی ون دەکرد، تا بتوانێت بە ئازادی بنووسێت و بیر بکاتەوە.

"دیکارت" دەیزانی حەقیقەتگەلێکی گەورەی لە بواری زانست و فەلسەفەدا کەشف کردووە، بەڵام هێشتا وەختیان نەهاتووە ئاشکرا بکرێن. گەر

ئاشکراش بکرێن ئەوا یەکڕاست بەر ئەو هەڵە باوانە دەکەون کە لە سەردەم و زەمانی ئەودا، وەکو ڕاستی حاشا هەڵنەگر خۆیان نیشان دەدا. یەکەمین هەڵەیەکیش "دیکارت" ڕووبەڕووی دەبووەوە، ئەو بۆچوونە بوو پێی وابوو زەوی سەنتەری گەردوونە و خۆر بە دەوری زەویدا دەسووڕێتەوە. ئەمەش بۆ خۆی وتەزایەکی "ئەرستۆ تالیسی" و "پەتلیمۆسی"بوو، مەسیحییەتی تەبەنی کرد و ڕەوایەتی ئاینی پێ بەخشی. لێرەوە ئەوەی بەم تێزەیە نارازی بێت، هەر بە تەنیا بەرپەرچی تیۆریایەکی زانستی ناداتەوە، بگرە بەگژ ئاینێکیشدا دەچێتەوە و خۆی ڕووبەڕووی مەترسی دەکاتەوە..

سەرومختێک "دیکارت" ئەوەی پێ گەیشت کە "گالیلۆ" لەلایەن ڤاتیکانەوە تاوانبار کراوە، ترسی لێ نیشت و کتێبەکەی لە چاپخانە کێشایەوە.. شایەنی باسە هێندەی نەمابوو بە ئاشکرا بۆچوونەکانی بخاتەڕوو، ئەویش لە ڕێی وتارێکەوە کە سیستمی جیهانی سروشتی باس دەکات و داکۆکی لە تیۆریاکەی "کۆپەر نیکۆس" دەکات، سەبارەت بە سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا. لەم سەروبەندەدا "دیکارت" بە هاوڕێ دڵسۆزەکانی دەڵێت: «من نامەوێت لە پێناو بۆچوونەکانمدا، ژیانی خۆم بخەمە مەترسییەوە». لە پای ئەمەشدا هەندێک بە ترسنۆک و کەمتەرخەم تاوانباریان کرد، بەڵام کێشەی ئەوانە لەوەدایە کە ئەم پرسیارە لە خۆیان ناکەن: "فایدەی بە چی گەر خۆی دووچاری ڕاوەدوونان یان تەنانەت پاکتاوکردنی جەستەییش بکات، بەر لەوەی توانیبێتی پەیامەکەی خۆی تەواو بکات؟".

"دیکارت" لەو کاتەدا تەمەنی گەشتبووە چل ساڵان، کەواتە دەرفەتی زۆری لەبەردەمدا مابوو بۆ ئەوەی پەی بە شتگەلێکی تر بەرێت. گەر بهاتبایە لەم ماوەیەدا ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی کلێسا بوایەتەوە، ئەوا بە ئاسانی تێکدەشکا و نەیدەتوانی شێلگیرانە بیر و بۆچوونەکانی کامڵتر بکات و لە گەڕانیدا بە شوێن هەقیقەتدا بەردەوام بێت. لێرەدا ناچار بوو ستراتیجییەتی شاردنەوە و سازشکردن بگرێتەبەر، تا بتوانێت ساڵانێکی

زیاتر بژی و تیژی فیکری نوێ بێنێته ئارا که دەستبەجێ و دوای له دنیا دەرچوونی، به گژ فێندەمێنتالیزمی ئەرسۆدەکسیدا چووەوە. سەر وەختێک فێندەمێنتالیستەکان له مەترسی ئەو تیزانەی به ئاگا هاتنەوە، کاری خۆی له کۆمەڵگه کردبوو. بەمجۆرە "دیکارت" ئەمانەتەکەی گەیاند و به ئارامی له گۆڕەکەیدا سەری نایەوە.

بێگومان پیاوانی ئاینی کتێبەکانی ئەویان خستە لیستی قەدەغەکراوەکان، لەگەڵ کتێبەکانی "کۆپەرنیکۆس و گالیلۆ و پاسکال و کیبلەر" و دەیان فەیلەسووف و زانای تر. بەڵام تازه به چی دەچێت! خۆ بیر و بۆچوونەکانی به هەموو ئەوروپادا بڵاو بووەوە و فەلسەفەکەشی، بوو به بابەتی خوێندن له چەندین زانکۆی هۆڵەندا و وڵاتانی تردا. بەمجۆرە "دیکارت" به کاوەخۆو بێ هیچ هەراو زەنایەک، گورزی خۆی وەشاند. ئەو دەیزانی شەڕێکی دوور و درێژ و گرانی لە بەردەمدایه و هێزه تاریک و داخراوەکانیش ڕەگوڕیشەیەکی پتەویان هەیه و هەروا به ئاسانی لەق نابن، کەواته پێویسته ڕاستەوخۆ ڕووبەڕوویان نەبینەوە، بگره بەشێوەیەکی پەنهان و لا بەلا ئەو پرۆسەیه ئەنجام بدەین. "دیکارت" به کارێکی پێویستی دەزانی که فەیلەسووف دەمامک بپۆشێت و زوو بەزوو دەستی خۆی ئاشکراً نەکات.

ئەو یەکێکه لەو فەیلەسووفه مەزنانەی مێژووی فیکری کرد به دوو بەشەوە، پێش خۆی و پاش خۆی. هەروەها توانی گەورەترین کۆدێتای فەلسەفی له مێژووی سەردەمه نوێیەکاندا بەرپا بکات، ئەمەش ئەو کودەتایه بوو "ئەرستۆ"ی لەسەر تەختی فەلسەفه هێنایه خوارێ و کۆتایی به دەسەڵاتی هێنا که بۆ ماوەی دوو هەزار ساڵ بەردەوام بوو. هەژموونی فەلسەفەی "ئەرستۆ" موسڵمانان و ئەوروپای مەسیحیشی وەکو یەک گرتەوە، بەڵام به هاتنی "دیکارت" فەلسەفەی مۆدێرن دەست پێ دەکات.

پێکدادانی نێوان زانا و فەیلەسووفان و فێندەمێنتالیستە مەسیحییەکان شـــتـــێکی چاوەڕوانکراوبوو، لەبەر ئەوە شـــالاوی ڕاوەدوونانی زانا و فەیلەسووفەکان لە سەرجەم ئەوروپادا زیادی کرد. بۆ نموونە لە هۆڵەندا و دەستبەجێ دوای دادگاییکردنەکەی "گالیلۆ"، پزیشک و زانای بواری کیمیا "ڤان هێلمۆنت" دەسگیر کرا. لە بەلجیکاش "بێرنۆی" زانا ناچار بوو لە وڵات هەڵبێت. هاوکات پرۆفیسۆر "ڤان فێلدین" لە زانکۆی (لۆڤان) زیندانی کرا، ئەویش بە تۆمەتی داکۆکیکردن لەو تیۆریا زانستییە نوێیانەی باس لە دروستبوونی گەردوون دەکەن کە بێگومان پێچەوانەی ئەو شتانەیە لە "سفر التكوين"دا هاتووە.

هەروەها لە ئیسپانیاش دادگاکانی پشکنین سانسۆرێکی توندیان دانابوو، لەبەر ئەوە "سابیکۆ"ی پزیشک تێکڕای نووسین و بەرهەمەکانی خۆی بە ناوی کچەکەیەوە بڵاو دەکردەوە و دوای چوارسەد ساڵ لە مردنی، ئەم فێڵەیان بۆ ئاشکرا بوو! هەر لەو سەردەم و ڕۆژگارەدا چاودێریکردنی خود لە لایەن خودەوە، تەشەنەی سەند.. ئەمە وای کرد زانایان تەنیا دوای لە دنیا دەرچوونیان، لێکۆڵینەوەکانیان بڵاو بکەنەوە. ئەگەر بڵاویشیان بکردایەتەوە، ئەوا ئەو پەرەگرافانەیان لێ لا دەبرد کە لەگەڵ بۆچوونی پیاوانی کڵێسادا نەدەگونجا.

ساڵی ١٥٤٦ بە تۆمەتی کوفر و بێ باوەڕی بیریاری هیومانستی "ئێتیان دۆلێ" سووتێندرا، لەبەرئەوەی داکۆکی لە لێکبووردنی ئاینی دەکرد. هەرچی بیریاری ئیتاڵی "کامبانێلا"شە، بۆ ماوەی زیاد لە چارەکە سەدەیەک زیندانی کرا، پاش ئەوەی دادگاکانی پشکنین دەستنووسەکانیان لێ برد. ئەمە لە کاتێکدا کە زانا و فەیلەسووفی بەناوبانگ "جۆردانۆ برۆنۆ"یان بە شێوەیەکی ترسناک کوشت و دواتر لە ئەشکەوتە تاریکەکانی ڤاتیکاندا و دروست لە ساڵی ١٦٠٠دا، لاشەیان کردە خۆراکی ئاگر. کەواتە ئیتر چۆن "دیکارت" لە زوڵم و زۆرییان ناترسێت؟ لەبەر ئەوە کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی "وتارێک

لەبارەی میتۆد"، لە ساڵی ١٦٣٧دا بەبێ ناو بڵاو کردەوە.

ئەگەرچی ئەو کتێبەی زۆر بە وریاییەوە نووسیبوو، چەند جارێکیش ڕایگەیاندبوو پابەندی پرەنسیپەکانی ئەو ئاینەیە کە لە ئامێزیدا گەورە بووە. تەنانەت کتێبە مەزنەکەی "ڕامانە میتافیزیکاییەکان"ی پێشکێش بە فەقیهە گەورەکانی سۆربۆن کرد، بۆ ئەوەی ڕەزامەندیی ئەوان بەدەست بێنێت. ئەوکات سۆربۆن ئەو زانکۆیە نەبوو کە ئەمڕۆ دەیبینین، بگرە تەنیا بریتیی بوو لە کۆلێجێکی تیۆلۆجی مەسیحی و ناوبانگێکی گەورە و گرانی لە ناوەخۆ و دەرەوەی فرەنسادا هەبوو. دەسەڵاتی ئەوەی هەبوو کتێب قەدەغە بکات یاخۆ مۆڵەتی بڵاوبوونەوەی بداتێ. هەروەها دەیتوانی فتوای ئاینی دەرهەق بە بیریاران دەربکات و بە خواستی خۆی، ئەوەی بیەوێت تەکفیری بکات و ئەوەشی نەیەوێت سەرفرازی بکات.

بەڵام هەموو ئەو ئامادەکاری و شارزشکردنەی "دیکارت" کردی، دواجار زۆر بە تەنگیەوە نەهات و دادی نەدا. لە ساڵی ١٦٤٩ واتە ساڵێک بەر لە مردنی، قەشەیەک لە قەشەکان بەناوی کوفر و لادانەوە، فتوایەکی لە دژی کتێبەکەی "پرەنسیپەکانی فەلسەفە" دەرکرد. لە ساڵی ١٦٦٣دا واتە سێزدە ساڵ دوای لە دنیا دەرچوونی، ڤاتیکان کتێبەکانی خستە لیستی کتێبە قەدەغەکراوەکانەوە. ئەمانە ئەو کتێبانە بوون کە کڵێسای کاتۆلیکی داوای لە لایەنگرانی خۆی دەکرد بە هیچ شێوەیەک نەیانخوێننەوە، لەبەرئەوەی پێچەوانەی ناوەڕۆکی عەقیدەی مەسیحین.

"دیکارت" لە ماوەی ژیانیدا بە حەسرەتەوە بوو، لەبەرئەوەی زانستی سروشتی بە بەراورد لەگەڵ زانستی خوداناسی، سەربەخۆیی خۆی وەرنەگرتبوو. هەڵوێستیشی لەم ڕووەوە جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ هەڵوێستی "گالیلۆ" و "پاسکاڵ"دا نییە. ئەوانیش دەیانوت: «ئەگەر جۆرە ناکۆکییەک لە نێوان بیروڕای کڵێسا و یەکێک لە تیۆریاکانی زانستی

مۆدێرندا دروست بوو، ئەوا پێویستە سەرلەنوێ تاوتوێی بیروڕاکانی کڵێسا بکەینەوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ زانست و ئەقڵدا بگونجێت». دواتر بزاوتی مێژوو بەو ئاقارەدا ڕۆیشت کە ئەو فەیلەسووفانە نەخشاندبوویان. ڕاستە سەردەمەکەیان گوێی بۆ نەگرتن، بەڵام دواجار دەرکەوت ئەوان ڕاستیان پێکاوە و تەواوی سەردەمەکەشیان هەڵە بوون. تەنانەت "پاپا"ی ئێستایش دان بە مەزنییاندا دەنێت و داوای لێبوردن دەکات لەو هەڵانەی لە مێژووی ڕابردوودا، کڵێسا دەرهەق بەوان ئەنجامی داوە.

## دیکارت و ڕۆشنگەری

دەتوانین بڵێین زۆربەی زۆری فەیلەسووفە فرەنساییەکان خاوەنی هێزێکی ڕەتکردنەوە و نایاندن و مەیلێکی کودەتاگەرانە بوون. ئەو فەیلەسووفەی نازانێت بەسەردەم و کۆمەڵگەکەی بڵێت "نا"، فەیلەسووف نییە. یەکەمین خەسڵەتی بیریارە مەزنەکان ئەو خواستە گەورەیە بۆ دوورکەوتنەوە لە "مێگەل" و ڕووبەڕووبوونەوەیە لەگەڵ ئەو بیر و بۆچوونانەی لە سەردەمەکەیاندا باڵادەستن، ئەویش بەو مەبەستەی ئەو بۆچوونانە لەبەر یەک هەڵوەشێنن و وەلاوەیان بنێن، لە پێناو هێنانە ئارای بۆچوونگەلێکی نوێدا. چونکە داهاتوو تەنیا لەسەر دارو پەردووی ڕابردوو دروست دەبێت.

لەم ماوەی دواییدا کتێبێکی قەوارە گەورە لە پاریس دەرچوو، کتێبەکە لەبارەی فەلسەفەی فرەنساییە لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە تا ئەمڕۆ. سەرپەرشتیاری گشتی کتێبەکە لێکۆڵیار "دۆنی ویسمان"ە کە پێشتر مامۆستای فەلسەفە بووە لە زانکۆی نیویۆرک و هەنووکەش لە زانکۆی سۆربۆنە. ژمارەیەک لێکۆڵیار بەشدارییان لە نووسینی ئەم کتێبەدا کردووە کە بریتین لە: "ئالان دۆلیبیرا" لەبارەی قۆناغی سەدەکانی ناوەڕاستەوە، "کلۆد مۆرالی" لەبارەی سەردەمی ڕێنیسانس، "ماری فردریش بیلیگران" لەبارەی سەدەی حەڤدە و فەلسەفەی دیکارتیزم، "جان لۆڤران" لەبارەی سەدەی هەژدە و سەردەمی ڕۆشنگەری. هەروەها جارێکی کەش "جان لۆڤران" لەبارەی سەدەی نۆزدەوە، دواجار "دۆنی ویسمان" لەبارەی سەدەی بیستەم. بەمجۆرە دەبینین تەواوی سەدەکان لەلایەن لێکۆڵیاری پسپۆڕ و بەناوبانگەوە، بەسەر کراوەتەوە..

ئەوەی دەیەوێت شتێک لەبارەی فەلسەفەی فرەنسایی بزانێت، با ئەم کتێبە بخوێنێتەوە کە لە شەشسەد لاپەڕە زیاترە. من بۆ خۆم چێژێکی زۆرم لە خوێندنەوەی بینی، بەتایبەت پێشەکییە گشتییەکەی و ئەو نەسکەشی تایبەت بوو بە "دیکارت" و سەردەمی ڕۆشنگەری. لەوێدا لێکدانەوەی نوێ و بۆچوونی تازەم بینی کە پێشتر بێ ئاگا بووم لێیان و وەک پێویست لێیان تێ نەگەشتبووم.

لە پێشەکی گشتیی کتێبەکەدا "دۆنی ویسمان"ی سەرپەرشتیاری پرۆژەکە دەڵێت: «بۆچوونێکی باو هەیە پێی وایە فەرەنسا وڵاتێکی فەلسەفی نییە، ئەوانەشی وا دەڵێن بەهانەیان ئەوەیە کە فەرەنساییەکان وەک ئەڵمانیای دراوسێیان و تەنانەت وەک ئنگلیزەکانیش، خاوەنی سەرێکی میتافیزیکی نین. تەنانەت زمانەکەشیان بۆ فەلسەفە و گوزارشتکردن لە زاراوە و دەستەواژە پڕ پێچوپەناکانی دروست نەبووە. بگرە هەندێ جار ئەوانە دەگەنە ئەو ڕایەی بپرسن و بڵێن: «ئەرێ بەڕاست شتێک هەیە بەناوی فەلسەفەی فرەنسایی؟!».

دەرهەق بەم پرسیارە ناقۆڵایە، پرۆفیسۆر "دۆنی ویسمان" دەڵێت: «بەڵێ فەلسەفەی فرەنسایی بوونی هەیە و سەنگ و قورسایی خۆشی هەیە!». هەر لە درێژەی قسەکانیدا دەڵێت: «من پرکێشی زیاتر دەکەم و دەڵێم فەلسەفەی فرەنسایی شەرم ناکات لەوەی، خۆی بە مەزنترین دوو فەلسەفە بەراورد بکات کە لە دنیادا هەن: ئەوانیش فەلسەفەی یۆنانی و فەلسەفەی ئەڵمانین. فەیلەسووفانی فرەنسا دەشێت بە سوکرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆ و هیگڵ و کانت و هایدگەر، بەراورد بکرێن.. فەیلەسووفانی ئێمە بەڕاستی فەیلەسووفن و هەر بە تەنیا وەکو هەندێک پێیان وایە نووسەر و ئەدیب نین.. دوا جار چ نەنگییەکی تێدایە گەر فەیلەسووف نووسەرێکی مەزنیش بێت؟». پاشان "دۆنی ویسمان" دێتە سەر ئەژمارکردنی هەندێک فەیلەسووفی بەناوبانگ، هەر لە "ئەبیلاروسان بیرنارەوە لە سەدەکانی ناوەڕاست، تا

مۆنتێن و دیکارت و ڕۆسۆ و ڤۆلتێر و پاسکال و مالبرانش و بیرگسۆن و سارتەر و دۆلۆز و دێریدا لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا".

لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین کە بە سووک سەیرکردنی فەلسەفەی فرەنسایی، لە ڕۆشنبیرانی فرەنسایی خۆیانەوە سەرچاوە دەگرێت، بەتایبەت ئەوانەیان کە زۆر لە ژێر کاریگەری فەلسەفەی ئەڵمانیدان. چونکە ئەوانە پێیان وایە فرەنساییەکان بۆ فەلسەفە دروست نەبوون، لەبەرئەوەی ڕۆحیان سووکەڵە و ڕووکەشە و فەلسەفەش پێویستی بە ئەقڵی سەنگین و مێشکی فراوان هەیە، وەک مێشک و ئەقڵی ئەڵمانەکان. ئەو ئەڵمانانەی رووباری ڕاین لە فرەنساییەکانیان جیا دەکاتەوە، بەڵام ئەم قسانە ناچنە گیرفانەوە. بۆ نموونە "کانت" زیاد لە جارێک دان بەوەدا دەنێت کە قەرزارباری "جان جاک ڕۆسۆ"یە. لە لایەکی ترەوە "هیگڵ"، "دیکارت" بە قارەمانی فیکر و دامەزرێنەری ڕاستەقینەی فەلسەفەی مۆدێرن ناونووس دەکات. لە ڕاستیدا "دیکارت" کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر سەردەمی خۆی و تەواوی سەردەمی نوێ بەجێ هێشت. هەروەها "مارکس" باس لە گرینگیی ئەو ڕۆڵە گەورەیە دەکات کە سوسیالیزمە فرەنساییەکان، لەبەرەو پێشبردنی فیکردا، گێڕاویانە. کەواتە بۆچی فرەنساییەکان بەشێوەیەکی مازۆخییانە خۆیان بچووک دەکەنەوە و لەبەردەم ئەڵمانەکاندا بە چۆکدا دێن؟ بۆچی بە ئەڵمانەکان سەرسامن و فەیلەسووفانی خۆشیان لەو ئاستە بەرزەدان؟!

سەبارەت بەوەشی کە زمانی فرەنسایی لە ئاست فەلسەفاندندا دەستەوەستانە، قسەیەکی زۆر بێمانایە. لەلایەکی ترەوە "میشیل سێر"، یەکێک لە گەورە فەیلەسووفانی فرەنسا لە ساتەوەختی ئێستادا پێی وایە: «بەدرێژایی ڕۆژگار خەسڵەتی سەرەکی زۆربەی زۆری فەیلەسووفانی فرەنسا، ئەوە بوو کە تێکڕایان دووچاری چەوسانەوە و ڕاوەدوونان بوونەتەوە و ناچار بوون لە تاراوگەدا بژین! بۆ نموونە ڕینییە دیکارت، ناچار

بوو ولاتی خۆی جێ بهێڵێت و بۆ ماوەی بیست ساڵ لە هۆڵەندا بژی. پاشان بۆ ماوەی چەند مانگێک لە سوێد مایەوە و لەوێ لای شاژنە کریستین گیانی سپارد.. دیکارت کاتێک ولاتی جێ هێشت، دەیویست لەو فەزا ناهەموارە رزگاری بێت کە لە فرەنسادا هەبوو، بەهۆی هەژموونی ترادسیۆن و دۆگمای ئەقلی و فێندەمێنتالیستی کاتۆلیکییەوە». زۆربەی فەیلەسووفانی فرەنسا، وەکو "میشیل سێر" دەڵێت: «هەستیان دەکرد بێگانەن لە نیشتمانی خۆیاندا و هاوسەردەمەکانیان تەریزیان لێ دەکەن.. ئەم فەیلەسووفانە لە رێی یاخیبوون لە ئەقڵییەتی باو و لێکشیتاڵکردنی بۆچوونە بەسەرچووەکانەوە، خۆیان سەلماند.. دیکارت بەگژ ئەرستۆ و تۆمای ئەکوینیدا چووەوە».

وەکو ئاشکرایە فەلسەفەی سکولائی واتە فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست کە لە قوتابخانەکانی ئەو سەردەمەدا لەلایەن قەشەکانەوە بە خوێندکاران دەوترایەوە، بریتیی بوو لە تێکەڵییەک لە فەلسەفەی ئەرستۆ تالیسی و بیر و باوەڕی مەسیحی. کێ ئەرکی ئەم تێکەڵکردنەی گرتە ئەستۆ و بەم کارە هەستا؟ ئەوەی ئەم کارەی کرد، "تۆمای ئەکوینی" بوو. ئەم پیاوە بۆ ماوەی چەندین سەدە لە جیهانی مەسیحیدا، هەیبەتێکی فیکریی گەورەی هەبوو. تەنانەت تا هەنووکەش رێبازەکەی هەر بەردەوامە، ئەویش لە رێگەی "تۆماییەکان" و فەلسەفەی تۆماییەوە.. ئەی با بزانین دیکارت" چی کرد؟ ئەوەی "دیکارت" کردی کودەتایەکی گەورە بوو بەسەر فەلسەفەی "تۆما"یدا و بەم کارەشی زەمینەی لەبەردەم هاتنە ئارای سەردەمی نوێدا خۆش کرد. گرینگیی "دیکارت" لە مێژووی فەلسەفەدا لێرەدایە. هەر لەبەرئەمەشە "هیگڵ"، بە قارەمانێک لە قارەمانەکانی فیکری مرۆڤایەتی ناونووسی دەکات.

لە راستیدا زۆربەی فەیلەسووفانی فرەنسا خاوەنی هێزی رەتکردنەوە و نایاندن و مەیلێکی کودەتاگەرانە بوون. لەبەر ئەوە زۆربەیان رووبەڕووی

سەرکۆنەکردن بوونەوە لەلایەن دەسەڵاتەکانی سەردەمەکەیانەوە، ئیتر دەسەڵاتی تیۆلۆجی بووبێت یان سیاسی یاخۆ کۆمەڵایەتی.. خەڵک لە دواییدا نرخ و بەهایان زانین، واتە دوای ئەوەی مردن و باجێکی گەورەیان دا. چاکترین نموونەش لەم ڕووەوە "جان جاک ڕۆسۆ"یە. "ڕۆسۆ" وەک کەسێکی نەفرەت لێکراو ڕاوەدوو نراو ژیا و، وەک مرۆڤێکی تاوانبار و ترسناک سەیر دەکرا!! خەڵک بەردبارانیان دەکرد و پەنجەرەی ماڵەکەیان دەشکاند، بەڵام دوای دە ساڵ شۆڕشی فەرەنسایی بەرپا دەبێت و یاد دەکرێتەوە. هەروەها لاشەکەی دەگوازنەوە بۆ گۆڕستانی کەسایەتییە مەزنەکان و کتێبەکانی دەکەنە دەستوور و بەرنامە بۆ کۆماری فەرەنسا!

لەلایەکی ترەوە "ڤۆلتێر"یش لە زیندانی بەناوبانگی (باستیل)دا دیل کراو دوای ئەوە بەرەو بەریتانیا هەڵهات، بەڵام بە پێچەوانەی "ڕۆسۆ"وە، "ڤۆلتێر" سێ مانگ بەر لە مردنی جەماوەر لە شەقامەکانی پاریسدا ڕێزیان لێ نا و ستایشیان کرد! لەگەڵ ئەوەشدا پیاوانی کڵێسا قبوڵیان نەبوو نوێژی لەسەر بکەن یاخۆ لە گۆڕستانی مەسیحییەکاندا بینێژن، لەبەرئەوەی بەکافر و زەندیقیان دەزانی. هەروەها "دیدرۆ" بۆ ماوەیەک لە زیندانی "ڤانسین" زیندانی کرا، بەڵام "کۆندرسیە" بڕیاری مردنی بەسەردا درا و لە زینداندا خۆی کوشت. دەکرێت هەمان شت لەبارەی دەیان بیریاری تریش بڵێین.

بە کورتی هەموو ئەوانەی لە ئێستادا فەرەنسا شانازییان پێوە دەکات و شەقام و گۆڕەپانە گشتییەکانی بەناوی ئەوانەوە ناو دەنێت، لە سەردەم و ڕۆژگاری خۆیاندا دژایەتی کراون و ڕاوەدوو نراون و بە نەفرەت کراون. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە پێویستە بیریار لە پێناو ڕاستی و بۆچوونەکانیدا باج بدات. ئەوەی دەیەوێت لە بواری فیکردا باج نەدات، ئەوا با بڕوات لە بری فیکر و فەلسەفە کارێکی تر بکات.

لێرە بەدواوە کەم تا کورتێک دەچمەوە سەر ئەو نەسکەی تەرخانە بۆ

"دیکارت" و ئەو نەسکەی باس لە سەردەمی ڕۆشنگەری دەکات. سەبارەت بە "دیکارت" نووسەر دەڵێت: «سەدەی حەڤدە، سەدەی فەلسەفەی دیکارتیزمە». تەواوی ئەو فەیلەسووفە فەرەنساییانەی دوای "دیکارت" هاتن، یان درێژکراوەی ئەون یاخۆ دژ بە ئەون. فەلسەفەی "دیکارت" سەربەخۆیی فیکری ڕەهای ئەقڵ ڕادەگەیەنێت و بە بۆچوونی ئەو ئەقڵ بڕیار لەسەر هەموو شتێک دەدات، گەر ڕاست بێت یان هەڵە، چاک بێت یان خراپ. پێویستە هەموو ئایدیا و بیر و باوەڕێک ملکەچ بێت بۆ پشکنینی ئەقڵ و بە شێوەیەکی لۆجیکی تاوتوێ بکرێت، بەرلەوەی پەسەندی بکەین یاخۆ ڕەتی بکەینەوە. لەمڕۆ بەدواوە نابێت پەسەندی بۆچوونێک بکەین، بە بیانووی ئەوەی سەرچاوەکەی "ئەرستۆ" یان "تۆمای ئەکوینی" یاخۆ سەرچاوەیەکی ئاینی یان فەلسەفی ترە. لەبەرئەوەی خۆمان خاوەنی ئەقڵێکین کە یەزدان پێی بەخشیوین و مافی ئەوەمان هەیە بەکاری بهێنین، تا چاک لە خراپی پێ جیا بکەینەوە. کەواتە بۆ دەبێت تا ئەبەد، شوێن کەلەپوورێکی دووبارە و قسە و باسی پێشینان بکەوین؟

بۆ ئەوەی بگەینە هەقیقەت، پێویستە میتۆدی گومانی ڕادیکالی بگرینە بەر. بەڵام دەبێت گومانکردنێکی بنیاتنەر پەیڕەو بکەین نەک وێرانکەر. "دیکارت" کەسێکی گومانکار و عەدەمی نەبوو، لەبەرئەوەی حەزی بە گومانکردن بووبێت، بگرە دەیویست بگاتە شتێک، بگاتە ئەنجامێک و توانی بگات. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە میتۆدە ئەقڵانییەکەی بوو بە عەقیدەی خۆرئاوا و خۆرئاوای گەیاندە قۆناغی کۆنترۆڵکردنی سروشت و گەردوون. کەواتە گومانکردنی ئەو بەرهەمهێن بوو، نەک گومانێکی نەزۆک بێت کە مرۆڤ لە ناخەوە وێران بکات. "دیکارت" گەیشتە ئەوەی گومان لە هەموو ئەو شتانە بکات کە لە قۆناغی منداڵی و قوتابخانەدا فێری بووبوو، بەمجۆرە توانی بیر و بۆچوونە هەڵەکان لە ناخی خۆیدا ڕیشەکێش بکات.

بێگومان ئەم پرۆسەیە پرۆسەیەکی ترسناکە و بەرەنجامەکانیشی

مسۆگەر نییە. چونکە ڕەنگە ببێتە مایەی تێکدانی هاوسەنگی و شلۆقبوونی کارەکتەری مرۆڤ، لەبەرئەوەی لەو کاتەدا تۆ دەچیتە شەڕێکەوە لەگەڵ خۆت و لەگەڵ کۆی ئەو شتانەی لە منداڵییەوە پێیان ڕاهاتوویت و فێریان بوویت. ئەم شەڕە بێ ئامانەی مرۆڤ لەگەڵ خودی خۆیدا، ئەو شەڕەیە کە "دیکارت" داوامان لێ دەکات ئەنجامی بدەین. ئەمەش هەمان ئەو شەڕەیە کە خۆی تێیدا سەرکەوت، دوای ماوەیەکی زۆر لە گومان و سەرگەردانی و ونبوون. "دیکارت" بەر لەوەی بگاتە هەقیقەت، دووچاری سەرگەردانی و ونبوونێکی زۆر هات.

کەواتە "دیکارت" یەکێکە لەو بیریارانەی دابڕانی گەورەی لە مێژووی فیکردا دروست کردووە، بەم پێیە ئەو دامەزرێنەری سەردەمە نوێیەکانە و ئەو کەسەشە کە کۆتایی بە سەدەکانی ناوەڕاست دێنێت. لێرەوە دەتوانین بڵێین: «فەلسەفە بەر لە دیکارت شتێکە و دوای ئەویش شتێکی دییە». لەم کتێبەدا باس لە گرینگیی دوو کتێبی سەرەکی "دیکارت" دەکرێت، ئەوانیش بریتین لە: «وتارێک لەبارەی میتۆد و ڕامانە میتافیزیکاییەکان».

سەبارەت بە سەردەمی ڕۆشنگەریش کە ڕاستەوخۆ دوای سەردەمی "دیکارت" دێت و بە درێژە پێدەری ئەو دادەنرێت، لێرەدا ناتوانم زۆر بە دوور و درێژی باسی لێ بکەم. ئەوەی دەمەوێت لێرەدا بیڵێم ئەوەیە کە ڕۆشنگەری ئەو سەردەمەیە تەواوی شارستانییەتی خۆرئاوای لەسەر دروست دەبێت، واتە ئەو شارستانییەتەی ئەمڕۆ هەموومان لە سایەیدا دەژین. سەبارەت بەم مەسەلەیە "جان لۆفران" دەڵێت: «سەردەمی ڕۆشنگەری دوای تێپەڕبوونی دووسەد ساڵ بەسەریدا و تا ئەمڕۆ، بە داهێنان و بوێری و نوێگەرییەوە سەراسیمەمان دەکات. چونکە توانی میللەتانی ئەوروپایی لە قۆناغی ملکەچی بۆ دەسەڵاتی ڕەها یان بۆ بیر و باوەڕی تیۆلۆجیی مەسیحی، بگوازێتەوە بۆ قۆناغی ئازادی و ڕۆشنگەریی ئەقڵ. لەم سەردەمەدا فەیلەسووفەکان توانییان بنەماکانی فێندەمێنتالستیی مەسیحییەتی

ئۆرسۆدەكسی، لەبەریەک هەڵوەشێنن و لە ڕێی ئەمەشەوە مۆنتسكیۆ دەستی کرد بە لێکجیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان لە یەکتری بەمجۆرەش بوار لەبەردەم هاتنە ئارای سیستمی دیموکراسی و حوکمی یاسادا ڕەخسا).

## کانت

کێ لە ئێمە خەون بەوەوە نابینێت، ڕۆژێک بێت وڵاتەکەمان ببێتە وڵاتێکی ئازاد و دیموکراسی و پێشکەوتوو؟ کێ ئاواتەخواز نییە، وڵات خاڵی بێت لە ستەمی سیاسی و دەمارگیریی ئاینی و گەندەڵیی ئابووری؟ ئایا ئێمەومانانێک کە لە خۆرئاوا دەژین، پێنج دەقە لێرە دەمابینەوە، گەر ئازادی و ڕێزی مرۆڤ و دەوڵەتی یاسا لە وڵاتەکانی خۆمان هەبوایە؟ بۆ ئەوەی لەو ماجەرایە تێبگەین کە ئێستا لە دەورمان ڕوو دەدات، پێویستە دووسەد ساڵێک بگەڕێینەوە بۆ دواوە، بۆ ئەوەی خۆمان بخەینە ئەو شوێنەی کە فەیلەسووفانی ڕۆشنگەری ئەوروپایی تێدا بوون. ئەوانیش لەو سەردەمەدا هەمان ئەو خەونانەیان هەبووە کە ئەمڕۆ ئێمە دەیبینین.

وڵاتانی ئەوانیش لەو قۆناغەدا پڕی بووە لە کێشە و شەڕی ناوەخۆیی و دەمارگیریی ئاینی و مەزهەبی و بەشی زۆری هاووڵاتییانیش هەژار و نەدار بوون. هاوکات ستەمکاریی سیاسی بڕستی لە بەر بڕیبوون و بیریاران بەهۆی لە چاپدانی کتێبێکەوە، دووچاری ڕاوەدوونان و سەرکوتکردن دەبوونەوە! پیاوانی ئاینی دەستیان خستبووە بینی خەڵکەوە، بەڵام هەنووکە وڵاتەکانیان بووەتە فیردەوسی یەزدان لەسەر زەوی. گەر بێتو "کانت" یان "جان جاک ڕۆسۆ" یاخۆ "ڤۆڵتێر"، زیندوو بنەوە و سەرێ لە گۆڕەکانیانەوە بێننە دەرێ، ئەوا بێگومان دڵخۆش دەبن و بەختەوەرییەکی زۆر دایان دەگرێت، چونکە دەبینن بۆچوونەکانیان لەسەر زەمینەی واقیع هاتووەتە دی.

وەکو دەزانرێت "کانت" کە بە مامۆستای خۆرئاوا و ترۆپکی ئەقڵانییەت و ڕۆشنگەری دەدرێتە قەڵەم، بە شێوەیەکی توند و تۆڵ هەریەک لە سیاسەت و

مۆراڵی پێکەوە گرێ دابوو. لەم کارەشیدا تەواو پێچەوانەی "ماکیاڤیللی" بوو کە ئەو دوو کایەیەی لە یەکدی جیا کردبووەوە و پێی وابوو ئامانج پاساوی ئامراز دەداتەوە و مۆراڵ شتێکە و سیاسەتیش شتێکە. "کانت" سەرەڕای میسالییەت و ئەو مەیلە مۆراڵییە باڵایەی ساویلکە نەبوو، بگرە دەیزانی هەق بەبێ هێز مانای نییە و تەنانەت پاساو بۆ شەڕیش دێنێتەوە، بەڵام بەو مەرجەی ببێتە مایەی بڵاوکردنەوەی ئازادی و ئایدیای پێشکەوتن و چەسپاندنی دەستووری مەدەنی لە ناو مرۆڤایەتیدا.

سەبارەت بە سروشتی مرۆڤایەتی، "کانت" گەشبین بوو، پێی وابوو بە بەردەوامی بەرەو پێش دەچین و ڕۆژێک دێت دەگەینە جیهانێک، پڕی بێت لە ئاشتی و لەسەر ماف و دادپەروەری و یاسای نێو دەوڵەتی دامەزرابێت. تەنانەت ئەو پێی وابوو ئاشتییەکی هەمیشەیی سەرتاسەری لە نێوان نەتەوەکاندا مەحاڵ نییە، بەمەرجێک ڕووناکیی مەعریفە بگاتە تەواوی مرۆڤایەتی و تەنیا لە ئەورووپادا قەتیس نەبێت. ئەو بەو پێیەی دیدگایەکی فەلسەفی دوور مەودای هەبوو، توانی پێشبینی ئەو شتانە بکات کە لە سەدەکانی دواتر ڕوویان دا، بۆ نموونە بۆچوونێکی لەبارەی نەتەوە یەکگرتووەکان پێشکێش کرد، تەنانەت بە دووسەد ساڵ بەر لە دامەزراندنی! گەورە فەیلەسووفەکان مەزنییان لەوەدایە، دەتوانن پێشبینیی ڕووداوەکانی ئایندە بکەن.

"کانت" بەردەوام تەئکیدی دەکردەوە لەوەی دەبێت ڕۆژێک بێت سەردەمی بەربەرییەت و دڕندایەتی کۆتایی بێت، ئەویش دوای ئەوەی شارستانییەت سەردەکەوێت و ڕووناکیی خۆی بەسەر تەواوی جیهاندا پەخش دەکات.. ئەگەر سەرنج لە ئەورووپای ئێستا بدەین، دەبینین بەرەو یەکەتی و بە ئەنجامگەیاندنی گەورەترین پەیجووری سیاسی لەسەردەمی مۆدێرندا دەچێت، ئەمەش مانای وایە پڕۆژە فیکرییەکەی لانی کەمی بە ئەنجام گەیشتووە. ئەوەی ماوە ئەوەیە وا بکەین ئەم پڕۆژە شارستانییە پەل

بکێشێت و نەک ئەورووپا و خۆرئاوا بە تەنیا، بگرە تەواوی میللەتانی دنیا بگرێتەوە. ئەو کات سەرجەم مرۆڤایەتی لە بەرهەمی ئازادی و دیموکراسی و پێشکەوتن بەهرەمەند دەبن. ئەڵبەتە ئەمە خەونێکە وا زوو نایەتە دی، بەڵام رەنگە رۆژێ بێت و جێبەجێ ببێت.

"کانت" پرۆژە سیاسییەکەی لەسەر چوار بنەما دارشتبوو:

یەکەم: ئاشتیی هەمیشەیی لە نێوان نەتەوەکاندا، لە ئەنجامی ئەو پێوەندییە سروشتییانەدا دێتە بەرهەم کە لە نێوان وڵاتە دیموکراسییەکان "یان لە نێوان وڵاتە کۆمارییەکاندا بە تەعبیری ئەو سەردەمە" دروست دەبێت. لێرەدا مەبەست لە دەوڵەتی کۆماری ئەو سیستەمە سیاسییەیە کە لەسەر یاسا و دەستووری مەدەنی و پابەندبوون بە فەلسەفەی مافی مرۆڤ و هاووڵاتی دادەمەزرێت.

دووەم: رۆژ بەڕۆژ ژمارەی وڵاتانی دیموکراسی زیاد دەکات، تا وای لێ دێت هەموو نەتەوەکان دەگرێتەوە.

سێیەم: ئەو دەوڵەتانەی لەسەر بنەمای دیالۆگی دیموکراسی و ئازادی و ئیرادەی گەل دروست بوون، زیاتر حەزیان بە پێوەندی دۆستانەیە لەگەڵ دراوسێکانیاندا نەک شەڕ و ئاژاوە.

چوارەم: وڵاتانی دیموکراسی بەلای ئەوەدا ناچن پێوەندی دۆستانەیان لەگەڵ وڵاتانی تۆتالیتاری و ئسوولیدا هەبێت، لەبەرئەوەی ئەمجۆرە دەوڵەتانە زمانی دیالۆگ نازانن و ئەوەی پێی راهاتوون زمانی لێدان و سەرکوتکردن و بەربەرییەتە.

بەڵام با بزانین کێ ئەم بەرنامە فەلسەفییە دانسقەیەی "ئیمانۆیل کانت"ی جێبەجێ کرد؟ رەنگە خوێنەر بەلایەوە سەیر بێت گەر پێی بڵێم کە سەرۆکەکانی ئەمەریکا، یەکەمین کەس بوون بە جدی بیریان لەوە کردەوە. بۆ نموونە دەکرێت لێرەدا ناوی "دوردرۆ ویلسۆن" بهێنین کە بیست و

هەشتەمین سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوو (١٩١٣-١٩٢١). ئەم پیاوە کە بۆ خۆی مامۆستای زانکۆ بوو، تەنانەت بەر لەوەشی تێکەڵ بە دنیای سیاسەت بێت و بگاتە لووتکە سەرۆکی زانکۆی برنستۆن بوو، هەروەها خوێندکاری فەیلەسووفی ئەڵمانی "کانت" بوو. "ویلسۆن" ئەو کەسە بوو دەستبەجێ دوای کۆتاییهاتنی جەنگی جیهانی یەکەم کۆمەڵەی نەتەوەکانی پێک هێنا، لە پێناو چارەسەرکردنی کێشەی نێوان میللەتان بە گەڕانەوە بۆ یاسای نێو دەوڵەتی، نەک چارەسەرکردنیان بە چەک و بە زەبری هێز.

بێگومان لەو کاتەدا ئەوە بیرۆکەیەکی تەواو شۆڕشگێڕانە بوو کە باوەڕت هەبێت بەوەی دەکرێت سیستمێکی جیهانی دابمەزرێندرێت، لەسەر بنەمای شتێک دوور لە هێز و هاوکێشەکانی هێز. ئەم سەرۆکە مەزنە خێر و چاکەی بۆ تەواوی مرۆڤایەتی دەخواست، نەک تەنیا بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا. هاوکات پێیوابوو دەکرێت مۆراڵ و سیاسەت ئاشت بکرێنەوە و ئەمەشی بەکارێکی پێویست دەزانی، لەبەر ئەوەی سیاسەت بێ مۆراڵ مانایەکی نییە. بۆ نموونە دەڵێت: «سەردەمەکەمان پێویستی بە سیستمێکی ترە بۆ شتەکان. ئەم سیستمەیش پێوەرەکەی پرسیارگەلێکی لەم جۆرە دەبێت: ئایا ئەمە هەقە؟ ئایا ئەمە چاکە؟ ئایا ئەمە ڕەوایە؟ پاشان ئایا ئەمە لە بەرژەوەندی تەواوی مرۆڤایەتیدایە؟».

"دودرۆ ویلسۆن" وەکو "کانت" لە بنەماڵەیەکی مەسیحیی پرۆتستانت مەزهەب بوو، سەرشار بوو بە مۆراڵی لۆسەری. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ "مارتن لۆسەر" کە لە سەدەی شازدەمدا بەدەرکەوت و زەمینەی بۆ بزووتنەوەی ڕیفۆرمی ئاینی لە ئەوروپادا خۆش کرد. مۆراڵی لۆسەری مۆراڵێکی زۆر توند و تۆڵە و سازش لەسەر پرەنسیپی هەق و ڕاستگۆیی و دڵسۆزی لە کار و جێبەجێکردنی ئەرکەکاندا ناکات. مرۆڤ بۆ ئەوەی لەمە دڵنیا بێت، ئەوەندەی بەسە ماوەیەکی کەم لە وڵاتانی باکوری ئەوروپای

پرۆتستانتی وەک: (ئەڵمانیا و هۆڵەندا و سوید و.. هتد)، بژی.

لێرەوە دەتوانین بڵێین گەر ئەمەریکا شتێکی ئیجابی بەخشیبێتە جیهان، ئەوا بێگومان ئەمەیە. بەڵام ئەڵبەتە ئەمەریکا جگە لەمە ڕوویەکی تریشی هەیە، مەبەستم ڕووی "کیسنجەر و نیکسۆن" و کەسانی تری پراگماتی و ماکیاڤیللیزمی وەک ئەوانن کە کۆ لەوە ناکەنەوە هەرچی شتێک هەیە بە کاری بهێنن، لە پێناو گەیشتن بەوەی خواستیانە. واتە لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکادا لایەنی ڕووناک و لایەنی تاریک هەیە. سیاسەتێکی واقعییان هەیە کە زۆر درێژە و شێوازی نهێنی و ژێر بەژێر بەکار دێنێت، بە مەبەستی ئەنجامدانی کودەتاکردن لە وڵاتانی ئەمەریکای لاتین و وڵاتانی تری دنیا. بەڵام هەڵەیە گەر هەر ئەم ڕووەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمەریکا ببینین و ڕووەکەی تری ئومەی ئەمەریکی فەرامۆش بکەین کە ڕوویەکی مۆراڵییە و پڕ ئومێدە.

با جارێکی تر گوێ بگرین بۆ سەرۆک "ویلسۆن": «پرەنسیپێکی سەرەکی هەیە کە ئاراستەی تەواوی کار و سیاسەتەکانم دەکات، ئەویش پرەنسیپی هەق و یەکسانییە بۆ سەرجەم گەل و نەتەوەکان. مەبەستم ئەوەیە مافی خۆیانە لە کەشێکی ئازاد و بەشێوەیەکی یەکسان، بە ئاشتی لەگەڵ یەکتریدا بژین. ئیتر ئەگەر لاواز بن یان بەهێز، گرینگ نییە ئەگەر ئەم پرەنسیپە پێشێل کرا، نە عەدالەتی گەردوونی ڕوو دەدات و نە بەردەوامیش دەبێت. پێویستە میللەتی ئەمەریکا لەم پرەنسیپە مۆراڵییە لانەدات و ئامادەش بێت قوربانی بە ژیان و شەرەف و هەموو ئەو شتانەی هەیەتی بیدات، لە پێناو بەرگریکردن لەم پرەنسیپە!».

کێ دەتوانێت قسە لەمە چاکتر بکات؟ یاخۆ سەرۆکی چ دەوڵەتێک لەباریدایە لەوە دوورتر بڕوات؟ ئایا ئێمە لێرەدا ئاشتبوونەوەی گەورەی نێوان مۆراڵ و سیاسەت نابینین؟ ئێمەی بێ دەسەڵاتانی سەر ئەم زەمینە

لەمە زیاتر شتێکی ترمان دەوێت؟ بەداخەوە سیاسەتی ئەمەریکی بەردەوام کاری بەم پرەنسیپانەی "ویلسۆن"ی مەزن نەکردووە و زیاد لە جارێک لە راستە رێگە لای داوە، بەلام ئەمە بەو مانایە نایەت کە بەردەوام بەد و خراپ بووە، وەکو دیماگۆگی و هەڵەوەرەکانی جیهانی عەرەبی و ئیسلامی پێیان وایە. ئەوانەی تەقینەوەکانی نیویۆرک و واشنتۆن و دوورگەی بالی لە ئەندۆنیسیا و ریاز و دارلبەیزا، لەلایەن توندرۆیە تیرۆریستەکانەوە بە کارێکی رەوا دەزانن.

ئەوانە پێیان وایە تیرۆرستەکان مافی خۆیانە ئۆتۆمۆبیلە مینرێژکراوەکانیان بە هاوولاتییانی عێراقدا بتەقێننەوە، هەر لە نەجەفەوە بۆ هەولێر و فەلووجە و بەغدا و لە پای ئەم کارەشیاندا دەبێت ئافەرینیان بکەین، لەبەرئەوەی ئەوانە هێزی مقاوەمەن دژ بە داگیرکاران! ئیتر بزانن ئەم مقاوەمەیە چەند "مەزنە!".. بێگومان وەلامی "جۆرج دەبلیو بوش" بۆ ئەو تاوانبارانە، وەلامێکی توند و بەهێز بوو. بەلام ئایا هەر بە تەنیا وەلامی سەربازی بەسە، بێ ئەوەی هاوشان بێت بە سیاسەتێکی کۆمەلایەتی و ئابووری و کولتووریی پراوپر و هەماهەنگی لەگەڵ جیهانی ئیسلامیدا بکات بەشێوەیەکی گشتی؟

لێرەدا "جۆن کێری" دێتە ئاراو هەندێک بیر و بۆچوونی نوێ پێشنیاز دەکات کە ئەوە دەهێنێت گرینگی پێ بدرێت. بۆ نموونە ئەو پێی وایە جیهانی عەرەبی هەر لە مەراکیشەوە تا عێراق، موبتەلای قەیرانی ئابووری و دۆگمای فیکری و هەژارییەکی بێ ئەندازەیە. هاوکات بە دەست تەقینەوەیەکی دیمۆگرافییەوە دەناڵێنێت، لەگەڵ داخرانی تەواوی هەموو ئاسۆیەک لە بەردەم دەرفەتی کارکردن و تەوزیفبووندا. بەمجۆرە هەموو ئەو رەگەزانە لە ئارادان کە زەمینەی تیرۆر و توندرۆیی خۆش دەکەن.. واتە "کێری" بۆ رووبەڕووبوونەوەی تیرۆرستان وەکو "بوش" هەر بە تەنیا لەسەری تیرۆر نادات، بگرە لە رەگوڕیشەوە چارەسەری کێشەکە دەکات.

"کیری" بەلایەوە سەیرە چۆن ٦٠٪ ژنانی وڵاتانی عەرەبی نەخوێندەوارن، هەروەها سەری سڕ دەمێنێ لەوەی چۆن بەر لە سی ساڵ میسر و کۆریای باشوور لە ڕووی گەشەکردنەوە یەکسان و چۆنیەک بوون، بەڵام کۆریای باشوور لە ڕووی ئابوورییەوە هەنگاوی گەورەی ناو، لە ئێستادا کێبڕکێ لەگەڵ وڵاتانی پیشەسازی خۆرئاوادا دەکات. ئەمە لە کاتێکدا میسر تا ئێستاش لە شوێنی خۆیدا دێت و دەچێت.. هاوکات ئەوەش بۆ ئەو شوێن پرسیارە کە چۆن جیهانی ئیسلامی، ئەو جیهانەی یەک لەسەر چواری دانیشتوانی دنیا "ملیارێک و سێسەد ملیۆن" پێک دێنێت، بەشداریکردنی لە ئابووری جیهانیدا تەنیا لە سەدا چوار یان لە سەدا پێنج دەبێت!

هەموو ئەم پێدراوانە پێویستە بە هێند وەربگیرێت، تا تێ بگەین بۆچی بزاوتە توندڕۆکان و دەمارگیری لە جیهانی ئیسلامیدا لە هەڵکشاندایە. پێویستە لێرەدا هۆکاری ڕۆشنبیریش سەرباری هۆکارەکانی پێشوو بخەین و باس لە ڕادەی هەژاری کتێبخانەی عەرەبی بکەین کە چەند بێ بەشە لە سەرچاوەی زانستی و فەلسەفی. بێگومان ئەو سەرچاوانە دەتوانن جیهانبینییەکی نوێ بێننە ئارا، لە بەرامبەر ئەو جیهانبینییە ئسووڵییەی لە ڕووی مێژووییەوە باڵا دەستە. کەواتە دەبێت لەسەر زیاد لە ئاستێک قۆڵی لێ هەڵماڵین، تا کارەکانمان سەرکەوتوو بێت و بەرهەم بدات. ئەمەش پرۆسەیەکی دژوار و درێژخایەنە و ئاکامیشی نادیارە. من لای خۆمەوە لایەنی فیکری، بە ڕادەی گەشەی ئابووری و چاکترکردنی گوزەرانی خەڵک بە گرینگ دەزانم.

بۆ دەرچوون لەو قەیرانە کوشندەیەی تێی کەوتووین، بیریاری میسری "سید القمنی" پێشنیاز دەکات کار بە میتۆدە زانستییە مۆدێرنەکان بکەین، ئەمەش بۆ خۆی هەڵوێستی مرۆڤێکی دەروەست و خەمخۆرە. بەڵام ئەمە دەتوانێت لە بەرامبەر لێشاوی ئەو وتارە نابینا و فۆبیا ئامێزانەدا چی بکات کە لایەنگرانی ئایدیۆلۆجیای تەقلیدی ڕەواجی پێ دەدەن؟

دەتوانین چی بکەین لە بەرامبەر ئەو گوتارە دەستەجەمعییە بێ ئامانەی دروشمی، مەرگ بۆ ئەمەریکا و نەفرەت لە ئەمەریکا و بڕووخێ ئەمەریکا دەڵێتەوە؟! ئایا ئەوانە دەزانن کە تەواوی ئەو دۆزینەوە زانستییانەی لە سەرجەم بوارەکاندا دەکرێت، لە ئەمەریکادا ئەنجام دەدرێت؟ لەوە بە ئاگان کە ئازادی ویژدان و بیرورا و قسەکردن لە ئەمەریکا و هەموو وڵاتانی ئەوروپاییدا مسۆگەرە؟ ئەوانە دەزانن بۆ ماوەی چوار سەدەیە "ڕۆح" لە ئەوروپادا بارگەی خستووە و هەشت سەدەشە سەرزەمینی وڵاتانی ئێمەی جێ هێشتووە؟ لێرەدا کە باس لە "ڕۆح" دەکەم، بە مانا هیگڵییەکەی باس دەکەم کە مەبەست لێی شارستانی و فیکر و باهۆزی ئازادییە.

## کانت و ڕۆشنگەری

ساڵی ١٨٠٤ "ئیمانوێل کانت"، مەزنترین فەیلەسووف لە مێژووی نوێی خۆرئاوا و بگرە لە مێژووی مرۆڤایەتیشدا، ماڵئاوایی لە دنیا کرد. "کانت" ساڵی ١٧٢٤ هاتبووە دنیاوە، کەواتە هەشتا ساڵ ژیاوە. تەمەنێکی واش بۆ ئەو سەردەمە زۆر بووە و بەرامبەر بە سەد ساڵی سەردەمی ئێستایە. ئەم تەمەنە درێژە بواری ئەوەی بۆ ڕەخساند، کە بەرهەمە فەلسەفییە مەزنەکانی لەسەرخۆ تەواو بکات. "کانت" لە ڕووی فەلسەفییەوە ئەگەر بە "نیچە و هیگڵ" بەراورد بکرێت، درەنگ وەختێک پێگەیشت و کامڵ بوو. بۆ نموونە "هیگڵ" شاکارە گەورەکەی خۆی واتە "فینۆمینۆلۆجیای ڕۆح"ی، لە تەمەنی سی و پێنج ساڵیدا نووسی و هەرچی "فردریک نیچە"شە، ئەوا "گۆڕانی تراجیدیا"ی بەر لە تەمەنی سی ساڵی نووسی! لە کاتێکدا گەر بهاتبایە و "کانت" بەر لە تەمەنی پەنجا و حەوت ساڵی بمردایە کەس ناوی نەدەبیست، چونکە کتێبە بەناوبانگەکەی "ڕەخنەی ئەقڵی پەتی" لەو تەمەنەدا نووسی.

زۆرێک هەن پێیان وایە "کانت" ترۆپکی ڕۆشنگەریی ئەورووپایە، لەبەرئەوەی توانی ئەقڵانییەت بگەیەنێتە دوا مەنزڵی خۆی و هەروەها زاتی ئەوەشی کرد بەشێوەیەکی ڕادیکالانە، فەلسەفە لە تیۆلۆجیای مەسیحی جیا بکاتەوە. ئەم کارەی ترسی خستە دڵی هاوسەردەمەکانیەوە و ئۆقرەی لەبەر بڕین. ئەمەش مانای وایە کە فیکری ئەو بێ ئەندازە ڕادیکالی بووە، بەڵام هەنووکە و دوای تێپەڕبوونی دووسەدە بەسەر مردنیدا بۆ ئێمە فەیلەسووفێکی ئاسایی و بێوەی دێتە پێش چاو کە کەس نیگەران ناکات "بێگومان ئەمە لە تێڕوانینی ڕۆشنبیرێکی ئەورووپاییدا، نەک خۆرهەڵاتی یان ئیسلامی".

بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی دروست لە سەنگ و قورسایی ئەو و ئەو گۆڕانە گەورەیە بگەین کە لە مێژووی فیکردا دروستی کرد و لەو دابڕانە فەلسەفییەش حاڵی بین کە لەو ڕۆژگارەدا هێنایە ئارا، پێویستە لە هەلومەرجی سەردەم و زەمانی ئەو ئاگادار بین. "کانت" بە تەنیا فەلسەفەی لە تیۆلۆجیای ئاینی و میتافیزیکای غەیبانی و ئەبستراکت جیانە کردەوە، بگرە فەلسەفەشی لەسەر بنەمایەکی ورد و زانستی و تۆکمە دامەزراند. شایەنی باسە کۆی فەلسەفەی "ئیمانوێل کانت"یش، جگە لە تیۆریزەکردن و خوردکردنەوەی ئەو شۆڕشە زانستییە یاخۆ فیزیایی و ماتماتیکییەی ئاراستەی خۆرئاوا و جیهانی گۆڕی "مەبەستم شۆڕشی ئیسحاق نیوتنە کە لە دوای گالیلۆ و دیکارت و کیبلەر"ەوە هات، شتێکی تر نییە. لێرەوە ئەو دەستەواژە بەناوبانگە هاتە ئارا کە دەڵێت: "گەر نیوتن نەبوایە کانت نەدەبوو!".

ئەو شتەی "کانت"ی سەرسام کرد ئەوە بووە چۆن زانستی نوێ بوو بە شتێکی مومکین؟ چۆن چۆنی زانستی فیزیک و ماتماتیک، گەیشتنە دۆزینەوەی ئەو ڕێسایانەی ئاراستەی گەردوون دەکەن؟ چۆن مرۆڤ تەنیا لە ڕێی ئەقڵی خۆیەوە توانی بگاتە ئەوەی پەی بەو نهێنییانە بەرێت کە لە دنیادا هەیە؟ ئەو پێی وابوو گەیشتنی "نیوتن" بە یاسای کێشکردن، کارێکی سەیر و تاقەت پڕووکێن بووە. "کانت" بە تەنیا فەلسەفەی زانستی پێشکێش بە ئەوروپا نەکرد، بگرە هاوکات فەلسەفەی مۆراڵی و تەنانەت فەلسەفەی سیاسیشی بەردەست خستن. باشترین بەڵگەش لەسەر ئەوە، ئەم کتێبەیە کە ئێستا لەبەر دەستماندایە. ئەم کتێبە سێ دەق لەخۆ دەگرێت: یەکەمیان بریتییە لە ئاشتیی هەمیشەیی نێوان نەتەوەکان و دووەمیش بەم ناونیشانەیە: چۆن لە دەهلیزەکانی فیکردا سەر دەربکەین؟ سێیەم وتاریش بریتییە لە: ڕۆشنگەری چییە؟ هەرسێ دەقەکە لە دووتوێی کتێبێکدا کراونەتە فرەنسایی و خاتوو "فرانسواس برۆست" پێشەکی بۆ نووسیوە.

لێره به دواوه چاوێکم لەسەر ئەم کتێبە دەبێت، بۆ ئەوەی پانۆرامایەکی گشتی لەبارەی بابەتەکە بخەمە ڕوو.. لە کۆی هەرسێ بابەتەکەش، قسە لەسەر ئەو دەقە دەکەم کە تایبەتە بە ڕۆشنگەری. "فرانسواس برۆست" لەو پێشەکییەدا دەڵێت: «ساڵی ١٧٨٤، واتە سەروەختێک کانت گەیشتە تەمەنی ٦٠ ساڵی و نێوبانگی پەیدا کرد و ڕۆشنگەریی ئەڵمانی گەیشتە ترۆپک، یەکێک لە ڕۆژنامەکانی شاری بەرلین ئەم پرسیارەی ئاراستەی بیریارانی ئەڵمانیا کرد: ڕۆشنگەری چییە؟ مانای ئەم بزاوتە فیکرییە چییە کە تەواوی سەدەی هەژدەی بەخۆیەوە سەرقاڵ کرد، بەتایبەتی لە فەرەنسا و ئنگلستان و ئەڵمانیا و بووە مایەی هاتنە ئارای عەقڵییەتێکی نوێ؟ ئەم پرسیارە وەکو ڕاپرسییەک وابوو کە ئاراستەی ڕۆشنفکرانی ئەڵمانیا کرابوو».

بەر لەوەی "کانت" وەڵام بداتەوە و ڕا و بۆچوونی خۆی لەسەر ئەو مەسەلەیە بخاتە ڕوو، هەندێک ڕۆشنبیر وەڵامی خۆیان دابووەوە. سەرنووسەری ئەو ڕۆژنامەیەی پرسیارەکەی کردبوو، هاوڕێی "کانت" بوو، تکای لێ کردبوو وەڵام بداتەوە، لەبەرئەوەی تەواوی خوێندەوارانی وڵاتی ئەڵمانیا چاوەڕێی وەڵامی ئەویان دەکرد.. وتم ئەڵمانیا و لە کاتێکدا دەبوو بڵێم پروسیا، لەبەرئەوەی ئەوکات ئەڵمانیایەکی یەکگرتووی وەکو ئەمڕۆ نەبوو، ئەوەی هەبوو وڵاتێکی پارچە پارچە و لێک دابڕاو بوو کە بەسەر دەیان میرنشینی بچکۆلە و دوژمن بەیەک دابەش بووبوون.

"کانت" وەڵامی ئەو ڕاپرسییە ڕۆژنامەوانییەی دایەوە و وەڵامەکەشی لە دە لاپەڕەیەک تێپەڕی نەکرد. ئەمە مانای وایە کە ئەم نووسینەی دەقێکی کورتە بە بەراورد لەگەڵ بەرهەمە فەلسەفییە مەزنەکانیدا، بەڵام سەرەڕای کورتیشی ئێجگار گرینگە، لەبەرئەوەی گوزارشتە لە تێکەڵبوونی فەیلەسووف بە کێشە و گرفتەکانی سەردەمەکەی خۆی. بەپێی ئەو بۆچوونە تەقلیدی و باوەی هەبوو، فەیلەسووف ئەو کەسە بوو کە لە قوولە بەرز و دوورەکاندا دەژیا و لە جیهان و کۆمەڵگە دادەبڕاو ئەو شتانەشی دەنووسی

کە کەس لێی تێ ناگات! بێگومـان ئەم جـۆرە وێناکـردنە بۆ فـەیلەسـووف ڕاست نییە و فـەیلەسـووفێکی مەزنـی وەکو "کانت" ئەم حوکمـە نایگرێتـەوە، فـەیلەسـووفـێک کـە لە ناخــەوە هەست دەکـات بـەوەی بەرپرسـیـارە لەوەی ڕێبـەریی مـرۆڤایەتی بکات بـەرەو ڕووناکی و هەقیقـەت. وەک دەزانرێت دوای بڵاوبوونەوەی "ڕەخنەی ئەقڵی پەتی" سـاڵی ١٧٨١، هەموو قسـەیەکی کە ئەو دەیکرد لە تەواوی وڵاتی ئەڵمانیا و تەنانەت ئەوروپاشدا دەنگی دەدایەوە.

"مـیشێل فۆکۆ" پێی وایە "کـانت" بە بڵاوکـردنەوەی ئەم دەقە گۆڕانێکی لە مێژووی فەلسەفەدا دروست کرد، ئەویش خۆخەریککردنی فەیلەسووفە لەگەڵ کێشە گەورەکانی کۆمـەڵگە و سـەردەمـەکەیدا . ئەو یەکێکە لەوانەی تەواوی کـتێبـەکـانی بە وشــەی "ڕەخنە" دەست پێ دەکـات: "ڕەخنـەی ئەقڵی پەتی، ڕەخنـەی ئەقــڵی زانســتی، ڕەخنـەی بەهرەی حــوکم". ئاشکرایە ئەو وتە بەناوبانگە وتەی "کانت"ە کـە دەڵێت: «ڕۆژگاری ئێـمـە ڕۆژگـاری ڕەخنەیە و پێویستـە هەموو شتێک بەر ڕەخنە بدرێت، تەنانەت قسـە و باسی پیـاوانی کڵێـسـاش.. ئەوانە نـابێت هەر لەسـەروو ڕەخنەوە بن، چونکە ئەوە مـانای بەکـەمگرتنی ئەقڵ و کـۆسپ خسـتنە بەردەم پێشکەوتن و پەردەپۆشکردنی هەقیقەت دەگەیەنێت. کەواتە ڕۆشنگەری مانای ئەوەیە مافی ئەوەمان هەبێت ڕەخنە بگرین، واتە دەست کـراوە بین لـەوەی زۆر ئازادانە ئـەقـڵی خـۆمـان بەگــەڕ بخـەین و تیـۆلۆجـیـسـتـەکـانیش نەتوانن سـنووری بۆ دابنێن، ئەو تیـۆلۆجیسـتـانەی وەکی سـێبـەری یەزدان لەسـەر زەوی بـەسـەر سـەرمانەوە وەسـتـاون. لە کـاتێکدا ئەوانـە تەنیـا مـرۆڤن و لە گـوناه و هەڵەکـردنیش بەدەرنین، ئێستایش کاتی ئەوە هاتووە ئەو دەسەڵاتەیان سنووردار بکەین کە دەرهەق بە ئەقڵ و دەروونی ئینسـانەکـان بەکـاری دێنن، ئەویش لە ڕێگەی خستنەڕووی تەفسیرێکی ئەقڵانی بۆ ئاین و پەیامە سەرمەدییەکەی».

لە ڕاسـتیدا فەلسـەفەی ڕۆشنگەری بریتییە لە خوێندنەوەیەکی مـێژوویی و ڕەخنەیی و ئەقـڵانی تێکستـەکانی مـەسیحییـەت، ئەمەش ئەو خـوێندنەوەیەیە

کە هەریەک لە "ڤۆلتێر و ژان ژاک ڕۆسۆ" لە فرەنسا و "لیسینگ و کانت" لە ئەڵمانیا پێی هەستان. ئەم خوێندنەوە نوێیە بەر ئەو خوێندنەوە کۆن و ڕەگ داکوتراوەی پیاوانی ئاینی مەسیحی کەوت و بەرەنجامی ئەم پێکدادانەش ڕۆشنگەری لێکەوتەوە. دەبێت بەمجۆرە لەو بزاوتە فیکرییە گرینگە بڕوانین کە لە سەدەی هەژدەم لە ئەوروپادا تەشەنەی سەند و بووە مایەی ئەو قەڵەمبازە ژیارییەی کە بۆری خۆرهەڵات و جیهانی ئیسلامی پێ دایەوە. بەڵام داخۆ دەبێت "کانت" چۆنچۆنی پێناسەی ڕۆشنگەری کردبێت؟

لێرەدا جێی خۆیەتی نموونە بە هەندێک پەرەگرافی کورتی ئەو دەقە بەناوبانگەی بهێنینەوە.. "کانت" هەر لە سەرەتاوە دەنووسێت و دەڵێت: «ڕۆشنگەری دەرچوونی مرۆڤە لەو حاڵەتی ئیفلیجی و دەستەوستانییەی مرۆڤ خۆی لەمانەوە و بەردەوامێتی بەرپرسیارە. ئیفلیجیش ئەو بارودۆخەیە کە مرۆڤ ناتوانێت ئەقڵی خۆی لە دەرەوەی ڕێبەرایەتی کەسانی تر بخاتە گەڕ. مرۆڤی ئیفلیج خۆی لەوە بەرپرسیارە، چونکە هۆیەکەی ناگەڕێتەوە بۆ ونبوونی ئەقڵ، بگرە دەگەڕێتەوە بۆ دەستەوستانی ئەو لە بڕیارداندا و ترسنۆکی لە کارکردن بەو بڕیارانە، بەبێ ڕێبەرایەتی کەسانی تر. کەواتە دروشمی سەرەکی سەردەمی ڕۆشنگەری ئەوەیە: با هێندە ئازا بیت، بتوانیت ئەقڵت بخەیتە کار».

پاشان "کانت" بۆچوونی خۆی لەم بارەیەوە بەشێوەیەکی ڕوونتر دەخاتە ڕوو.. لە واقیعدا هەنگاونان لە قۆناغی ئیفلیجی ئەقڵییەوە بۆ قۆناغی بەرپرسیارێتی و بەرکەماڵی ئەقڵ، هەروا کارێکی ئاسان نییە. ڕەنگە بە قسە ئاسان بێت، بەڵام بە کردەوە زۆر گرانە.. کەسانێک هەن تەنانەت گەر تەمەنیان بگاتە شەستساڵانیش، باوکانیان وەکو منداڵ سەیریان دەکەن! منداڵی ئەقڵی دڵنیاییمان دەداتێ، لەبەرئەوەی مانای وایە کەسێکی تر لەبری ئێمە بڕیار دەدات و لێشی بەرپرسیار دەبێت. کەواتە با بە درێژایی ژیانمان منداڵ بین و گەورە نەبین! ئەمەش ئەو هەڵوێستی دەستەوستانی و

ترسنۆكييەيە كە "كانت" سەركۆنەی دەكات. لەم ڕوانگەيەوە تا هەنووكەش میللەتگەلێک هەن هەر منداڵن و گەورە نەبوون.

ئەگەرچی میللەتانی ئەورووپا لەو قۆناغی ئیفلیجی ئەقڵییە دەرباز بوون و بەشێوەیەكی سەربەخۆ بیردەكەنەوە، بەبێ ئەوەی هیچ كەسێک ڕەقیب بێت بەسەریانەوە، بەڵام ئەم پرۆسەیە تا ئێستاش لە خۆرهەڵاتدا ڕووی نەداوە. بۆ نموونە بڕوانە حاڵی گەلانی عەرەبی و ئیسلامی كە چۆن لە كاتی داگیركردنی وڵاتی كوەیتدا چەپڵەیان بۆ "سەدام حسێن" لێ دا و، لە كاتی كردەوە تیرۆریستییەكانی سەر شاری واشنتۆن و نیویۆركیش لە ئەمەریكا كە سێ هەزار كەسی پێكەوە تێدا كوژرا، خۆشحاڵییان نیشان دا.

تۆ بڵێی ئەم میللەتانە ڕۆشنگەر بن؟ بێگومان هەلومەرجی ئەم میللەتانە لە حاڵی میللەتی ئەڵمانی و میللەتانی تری ئەورووپایی لە ڕۆژگاری "كانت"دا، ئەگەر خراپتر نەبێت چاكتر نییە. كەواتە زۆر ئاسانە بڵێین: «خەڵكینە ئەقڵ ڕوون بن و بەرلەوەی هەڵسوكەوت بكەن و حوكم بەسەر هەر شتێكدا بدەن ئەقڵتان بەكاربهێنن». بەڵام ئەمە ناكەن، ئەویش لەبەرئەوەی مێشكیان پڕیەتی لە بیر و بۆچوونی هەڵە و سەدان ساڵە لە نەزانین و هەژاری و نەهامەتیدا نغرۆ بوون. كەواتە مرۆڤ بۆ ئەوەی لە قۆناغی ئیفلیجی ئەقڵی ڕزگاری بێت و بگاتە قۆناغی ڕۆشنگەری و كامڵبوون، پێویستە شەڕێكی بێئامان دژ بە خۆیی و هەموو ئەو شتە هەڵە و نادروستانە دەست پێ بكات كە لە سەرەتای تەمەنیەوە لەسەری ڕاهاتووە.

كەواتە ڕۆشنگەری لە دوو قۆناغ پێک دێت: یەكەمیان نێگەتیڤە و دووەم پۆزەتیڤ. سەرەتا پێویستە دەست بە ڕیشەكێشكردنی هەموو ئەو بیر و بۆچوونە نادروستانە بكەین كە لە دڵ و دەروونماندا چێنراوە و ڕەگی داكوتیوە. ئەمەش پرۆسەیەكی قورس و دژوارە و تەنیا ئەو بیریارە مەزنانە دەرهەقی دێن كە ڕێبەرایەتی میللەتەكانیان دەكەن بەرەو ڕووناكی و حەقیقەت، بەڵام میللەتان پێویستییان بە دەیان ساڵ هەیە بۆ ئەوەی پێ

بگەن و ئەقڵ ڕوون بن.. "کانت" تەواو لەم مەسەلەیە بەئاگا بوو، بەڵگەش ئەوەیە کە دوای چەند پەرەگرافێک و لە هەمان دەقدا دەڵێت: «بۆ ئەوەی ڕۆشنگەری بڵاو بێتەوە تەنیا شتێکمان پێویستە، ئەویش ئازادییە. مەبەستم لە ئازادیش مافی مرۆڤە لەوەی بە ئاشکرا ئەقڵی لە هەموو بوارەکاندا بەکاربهێنێت، بەڵام هەر کاتێک ئەم وشەیە بەکاردێنم دەبینم لە هەموو لایەک هاوار دەکەن: خەڵکینە عەقڵتان بەگەڕ مەخەن! ئەفسەر لە سوپادا دەڵێت: ئەقڵ بەکار مەهێنن، بگرە فەرمانەکان جێبەجێ بکەن و دوای ئەوە نارەزایی نیشان بدەن! فەرمانبەری باج دەڵێت: ئەقڵتان بەکار مەهێنن و لە شت مەکۆڵنەوە، بگرە باجەکانتان بدەن! قەشەکانی کڵێساش دەڵێن: ئەقڵتان بەکار مەهێنن و چەندوچوون مەکەن، بگرە بڕوا بێنن! کەواتە لە هەموو حاڵەتەکاندا دەبینین کۆت و بەند و سنووردارکردنی ئازادی هەیە».

بەڵام ئەم هەموو ترسە لە ئازادی بۆ؟ لەبەرئەوەی مانای یاخیبوونی بچووکە لە گەورە و جووتیارە لە دەرەبەگ و هاووڵاتییە لە حوکمڕانیی ستەمکار. کەواتە گەورەکان دژی ئازادین، لەبەرئەوەی سەردەمی کۆیلایەتی بۆ ئەوان دەست دەدات و گونجاوە بۆیان. تەنانەت هەندێک میللەت ئەوەندە بە کۆیلایەتی ڕاهاتووە، تەرێز لە ئازادی دەکات! ئەوانەی بۆ ماوەی چەندین سەدە ملکەچی هەمان سیستمی پەتریارکی و فیوداڵی و ئسووڵی و تیۆلۆجی و ستەمکارین، زاتی ئەوە ناکەن ئەقڵیان بەگەڕ خەن! لێرەوە "کانت" دەڵێت: «جۆش و خرۆشی میللەتانی ئەورووپا بۆ شۆڕشی فەرەنسایی، زۆر لە خودی شۆڕشەکە خۆی گرینگتر بوو!». لەبەر چی؟ لەبەرئەوەی جۆش و خرۆشێکی وا گوزارشت بوو لە خواست و ویستی ئەو میللەتانە، بۆ پێشکەوتن و ئامادەیی نیشاندانیش بۆ ئەوەی باجی ئەو پێشکەوتنە بدەن.

بێگومان دواتر ئەم شۆڕشە لە ڕاستە ڕێگەی خۆی لادەدات و پێ دەنێتە قۆناغی تیرۆر و تۆقاندن و پاشان پەڕاندنی سەری لویسی شازدە، لە ژێر مەقسەڵە بەناوبانگەکەدا.. هەموو ئەمانە "کانت" یان زۆر خەمبار کرد و بە

زیادەڕۆیی دەزانی! بەڵام بڕوای بە بێگەردیی ڕووداوی شۆڕش لەق نەبوو، ئەو شۆڕشەی لە هەناوی گەلانەوە هەڵدەقوڵێت. هەروەها بڕوای بە ئایندەی مرۆڤایەتی و ئەگەری بەرەو پێشەوە چوونی زیاتر و زۆرتری وەک خۆی مایەوە. دەکرێت تەواوی فەلسەفەی ئەو بە هەوڵێکی بلیمەتانە ناونووس بکەین، بۆ کردنەوە ڕێگەی هەقیقەت لەبەردەم ئەو ئینسانانەی ئازار دەچێژن و نەفامن.

"کانت" قوربانی بە ژیانی تایبەتیی خۆی دا، لەپێناو ئەوەی خۆی بۆ ئەرکێکی سەرەکی تەرخان بکات کە ئەویش ڕزگارکردنی ڕۆحی مرۆڤایەتییە، لەو کۆت و زنجیرانەی بڕستیان لەبەر بڕیوە و خەریکن دەیخنکێنن. ئەو پێیوابوو ئازادبوونی ڕۆح و سەرکەوتنی بەسەر ئەو کۆت و بەندانەی دیلیان کردووە، مەزنترین کارێکە کە هەر فەیلەسووفێک پێی هەستێت و بیکاتە دیارییەک بۆ میللەتەکەی و تەواوی مرۆڤایەتی.

## ململانێی نێوان ئەقڵانییەت و نا ئەقڵانییەت لە فیکری خۆرئاوادا

## کێشەی فردریک نیچە

تا هەنووکەش لە کایەی ڕۆشنبیریی فەرەنسادا ململانێی نێوان لایەنگرانی "کانت" و لایەنگرانی "نیچە" بەردەوامە! ڕەنگە ئەمە لە سەرەتادا شتێکی سەیر بێت.. دەبێت پێوەندی "کانت" و نیچە" بە کایەی ئەمڕۆی ڕۆشنبیریی فەرەنساییەوە چی بێت، لە کاتێکدا ئەوان سەروەختێکی دوور و درێژە لە ژیاندا نەماون؟ لە ڕاستیدا زیاد لە پێوەندییەک هەیە.. سەرەڕای ئەوەی هەندێک جار زیندووەکان لە ڕێی مردووەکانەوە ململانێ لەگەڵ یەکتریدا دەکەن، لە واقیعیشدا کێشەیەکی هەقیقی لە نێوان "ئیمانوێل کانت"ی دامەزرێنەری ئەقڵی زانستی خۆرئاوا و "فردریک نیچە"ی تێکوپێکدەری هەموو ئەقڵانییەتێکی دۆگمە و داخراودا هەیە. "کانت" باشترین کەسێکە سەردەمی ڕۆشنگەری بەرجەستە کردبێت، لە ڕێی ئەو هاوسەنگییە تۆکمە و بەرپرسیارییە ئەخلاقییە ئاست بەرزەی هەڵگری بوو، "نیچە"ش هات بۆ ئەوەی گومان لەو متمانە ڕەهایە بکات کە ئەقڵ بەخۆیی هەبوو، هەروەها سەرنجمان بۆ گرینگیی ڕێکەوت و تراجیدیا و هۆکاری نائەقڵانی، لە ئاڕاستەکردنی بزاوتی مێژوودا ڕابکێشێت.

وەکو ئاشکرایە "نیچە" لەگەڵ هەریەک لە "مارکس" و "فرۆید"دا، بنەماکانی سەردەمی گومانکردنیان لە فیکری فەلسەفی خۆرئاوادا داڕشت. ئەمانە لە بری گومانکردن لە ڕاستی و دروستیی شتەکان "وەکو دیکارت"، کەوتنە گومانکردن لە خودی ئەقڵ خۆی. ئیتر ئەقڵ وەکو ئەوەی "دیکارت و کانت و هیگڵ" لێیان دەڕوانی، نەمایەوە و کەوتە بەر ڕەخنە و پشکنین.

مەسەلەکان زۆر لەوەی ئێمە مەزەندەی دەکەین، ئاڵۆزتر و دژوارترن. مێژووش زۆر تراجیدیترە و کەمتر ئارامە و مایەی دڵنیاییە. بە کورتییەکەی ئەقڵ هەیە و نا ئەقڵانییەتیش هەیە. فەیلەسووفانێک هەن جەخت لەسەر هۆکارە ئەقڵانییەکان دەکەنەوە و متمانەی خۆیان دەدەن بە ئەقڵ، بەڵام لە بەرامبەریشدا فەیلەسووفانێکی ترمان هەن کە جەخت لە هۆکارە نا ئەقڵانییەکان دەکەنەوە و ڕۆڵی ئەو هۆکارانە لە گۆڕینی ئاراستەی مێژوودا بە هەند دەگرن.. وەک دەزانین مەسەلەی "گەشبینی– ڕەشبینی، بڕوابوون – بێ بڕوایی، دڵنیایی – گومانکردن"، مەسەلەیەکی ئێجگار کۆنە و لە دێر زەمانەوە هەبووە.

شایەنی باسە لایەنگرانی "نیچە" بە درێژایی سالانی شەست و حەفتاکان و لە سەروەختی ڕاپەڕینی کۆمەڵگەی فرەنسایی و شۆڕشی خوێندکاران و کرێکاران لە ئایاری ١٩٦٨دا، توانییان کایەی ڕۆشنبیریی فرەنسایی کۆنترۆڵ بکەن. لەو قۆناغەدا ئازادیی جنسی و فەلسەفەی چێژ بینین و شکاندنی تابۆ ئەخلاقییەکان و شۆڕش دژی خاوەن کار و ڕاپەڕینی ژنان لە دەسەڵاتی پیاو و نێرسالاری و.. هتد، تایتڵی هەرە گرینگی تێکستە فەلسەفییەکان بوون. ئەمە وای کرد لەسەر ئاستی فەلسەفی دید و بۆچوونەکانی هەریەک لە: "میشێل فۆکۆ و جیل دۆلۆز و جاک دێریدا"، ڕەواج پەیدا بکات. ئەمانە پەرچەکردارێکی فەلسەفیی قووڵیان دروست کرد، دژ بە ئاراستەی ئەزموونی خۆرئاوایی لەسەر ئاستی سیاسی کە قۆناغی کۆلۆنیالیزم و دوو جەنگی جیهانی و هاتنە ئارای فاشیزم و نازیزمی بەخۆیەوە بینی..

هاوکات ئەم فەیلەسووفانە کەوتنە سەرکۆنەکردنی ئاقاری مرۆگەری و شارستانییەتی خۆرئاوا کە خیانەتی لە پرەنسیپەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری کردبوو. ئەمانە وای کرد فەیلەسووفانی فرەنسا بە توندی بکەونە ڕەخنەگرتن لە کەپیتالیزم و ناوەندچێتی ئەوروپایی. سەرچاوەی

سەرەکی ئەو فەیلەسووفانە لەم پرۆسەیەدا، بیر و بۆچوونەکانی "نیچە" بوو. لەبەرئەوەی "نیچە" گەورەترین بیریارێکە پێشوەخت پەردەی لە ڕووی شێواندنی پرەنسیپەکانی ڕۆشنگەری و خەسڵەتە نێگەتیڤەکانی مۆدێرنەی پۆزەتفستی و پیشەسازی هەڵماڵیبێت.

مێژوو وەکو ئەوەی "هیگڵ" و "کانت" پێیان وابوو، تەنیا ئەقڵ ئاڕاستەی ناکات، بگرە ئەو هێزە نا ئەقڵانییە سەرشێتانەش بەڕێوەی دەبەن کە لە هەناویدا خۆیان حەشارداوە. گەر وا نەبوایە دوای دوو سەدە زیاتر لە سەردەمی ڕۆشنگەری و لە وڵاتانی هەرە پێشکەوتووی ئەوروپادا، بزاوتی فاشیزم و نازیزم پەیدا نەدەبوون. مەعریفە وەکو ئەوەی ئایدیالیستی ئەڵمانی مەزندەی دەکرد، شتێکی میسالی نییە بە دوور بێت لە حەز و بەرژەوەندی و ئارەزووی دەسەڵاتخوازی، بگرە مەعریفەش بۆ خۆی دەرگیری حەزی دەسەڵاتخوازی و بەرژەوەندییە، ئیتر بیریار بەمە بزانێت یان نا. وەکو دەزانرێت دواتر "میشێل فۆکۆ" ئەم بۆچوونەی "نیچە" دەوڵەمەندتر دەکات، کاتێک دێتە سەر باسی ئەو هەلومەرجە دەسەڵاتخوازییەی لە سەروەختی گۆڕانی زانستە مرۆڤایەتییە مۆدێرنەکانی وەک: "دەروونشیکاری و کۆمەڵناسی و یاساناسی، بەتایبەت یاسای سزادانندا" هاتە ئارا. دواجار "فۆکۆ" ئەو پێوەندییانەش ئاشکرا دەکات کە لە نێوان زانستە نوێیەکان و دیسپلینکردنی ئینسانەکاندا، لە کۆمەڵگە ئەوروپاییە مۆدێرنەکاندا هەیە.

ئەم ڕەخنەگرتنە لە مۆدێرنە توندڕۆیانەیە و هەندێک جاریش دەبێتە ئامرازێک بۆ لێدانی بنەما سەرەکییەکان و دەسکەوتە گرینگەکانی مۆدێرنە. لێرەدا ئەم ئاقارە لەگەڵ باڵی ڕاستڕەوە توندڕۆیەکاندا یەک دەگرێتەوە کە دژایەتی هەموو ئەو پێشکەوتنە کۆمەڵایەتی و یەکسانییە لە مافدا دەکات کە کۆمەڵگە ئەوروپاییەکان، دوای هەردوو شۆڕشی ئینگلیزی و فرەنسایی بە دەستیان هێناوە. بەمجۆرە دەبینین چەپی توندڕۆ بەبێ ئاگایی لەگەڵ ڕاستی توندڕۆدا یەک دەگرنەوە، بۆ پاکتاوکردنی مۆدێرنە و لەناوبردنی کۆی ئەو

دەسکەوتانەی بە درێژایی دوو سەدەی ڕابردوو بە دەست هاتوون.

لە چوارچێــوەی ئـەم ســیــاقـــەدا "هـابـرمـــاس" دێت، بۆ ئەوەی بـەر بەم بۆچوونانەی بیـــریارانی پۆست مـــۆدێرنە بگرێت کـــە بەهـۆی ڕەخنـەی پەرگـیـرانەیانەوە لە ئەقڵ و ئـەقـڵانیـیـەت، کـەوتوونەتـە داوی ڕێژەگـەرایی و عەدەمییەتەوە "لەم بارەیەوە بڕوانە کتێبەکەی: گوتاری فەلسەفی مۆدێرنە".

"هـابرمـاس" لەم کـتـێـبـەیدا ڕەخنە لـە "فۆکـۆ و دێریدا و هایدگـەر و نیـچـە"، دەگرێت و باس لـە ڕۆڵ و گرینگیی ئایدیای مـۆدێرنە و ئەقـڵانیـیـەت دەکات، بەڵام بەبێ ئـەوەی چاوپۆشی لە هەڵـە و لادان و کـەمـوکوڕییـەکـانی مـۆدێرنە بکات. هـەروەها ڕێگە بەوەش نادات گومان لە بیر و بۆچوونەکـانی سـەردەمی ڕۆشنـگـەری و سـەربەخـۆیی ئەقڵ بکرێت، لـەبەرئەوەی ئەوە بـە وێرانکـردنی ئایدیای پێشکەوتن و تەقـەلای مـرۆڤـایەتی دەزانێت.. ئەو پێی وایە دەوڵـەتی مـاف و یاسـا لەگـەڵ دەسـتـەبەرکـردنی لانی کـەمی مـافـەکـانی مـرۆڤی، وەک: "ئازادی ڕا دەربڕین و ڕۆژنامـەوانی و بڵاوکـردنەوە و هـاتوچۆکردن و... هتد"، شتێکە ناشێت بەهەند وەرنەگیرێت.

هەر لە چوارچێوەی ئەم سیاقەدا هەندێک بیریاری فـرەنسایی پەیدا بوون، کەوتنە داکۆکیکردن لە ئەقڵانییەتی "کانت" و بەگژاچوونەوەی نائەقڵانییەتی "نیچە". بۆ ئەم مەبەستەش ئەو بیریارانە خۆیان بە بۆچوونەکانی "هـابرماس" تەیار کرد، تا "میشێل فۆکۆ و جیل دۆلۆز و جاک دێریدا"ی پێ تاوانبار بکەن و بە کـەسـانی عەدەمی ناوزەدیـان بکەن. ئەڵبـەتە هەندێک بۆچوونی ئەمـانەش توندڕۆیی پێوە دیارە و زۆرجـار وەک شـەڕی شـەخـسی دێتـە پێش چاو، نەک لە چوارچێـوەیەکی بابەتی و فـەلسـەفـیـدا بێت، بەڵام دەبێت بڵـێین زۆرێک لە ڕەخنەکانی ئەوان لە "فۆکۆ" و "نیچـە" ڕەوایە و لە جێی خۆیدایەتی و بۆ ئێمە پێویستـە ئاگەداری بین، لانی کەم بۆ ئەوەی بزانـین لە ناو فیکری خۆرئاوادا چی دەگـوزەرێت. ئێمـە بمانەوێت یان نـا ئەم مـەسـەلەیە پێـوەندی پێمـانەوە هەیە، چونکە بەم دواییـیـانە هەندێک بیر و بۆچوونی "فـۆکۆ" گـەیشـتـووەتە

لامـــان، بەڵام وەکـــو پێـــویست ڕوون و ئاشـکرا نیـــیـــە.. بە هۆی ڕەخنـەی بێ ئامانی "فۆکۆ" لە ئەزموونی ئەقڵانییەتی خۆرئاوایی، خەڵکێکی زۆر لای ئێمە خـوێنگەرمـانە بە پیـر بۆچوونەکـانیـەوە چوون، منیش بۆ خـۆم یەکـێک بووم لەوانە.

گومـانی تێدا نییـە هەندێک لەو ڕەخـنانەی "فـۆکـۆ" و "دۆلۆز" و "دێریدا" لە خۆرئاوا و ئەزمـوونی ئەو شارسـتـانییەتە ڕاسـتە و لە جێی خۆیدایەتی، بەڵام پێـویسـتـە قـوربانیش بـە هەمـوو شـتـێک نەدەین. ڕەوتـی مۆدێرنە ئەزمـوونی بەسوود و پەندی بەکەڵکی تێدایە و گەر بزانین دەتوانین سـوودی لێ ببینین.. ڕەخنە ئەوە نییـە هەمـوو شـتـێک ڕەت کـەینەوە، بگرە مـانای وایـە بگەڕێینەوە سـەر ڕەوتی پێشـوو، تا ئەو هەڵانە ڕاست کـەینەوە کـە ڕوویان داوە و پەرگیـر نەبین لە حـوکـمـدانـەکـانمـانـدا. لەم سـەروبەندەدا و بەم دواییـیـانـە لە پاریس کتێبێکی "فەلسەفی ڕادیکاڵی" دەرچوو، نووسـەری ئەم کتێبە وەڵامی "فۆکۆ و دێریدا و دۆلۆز" و هەوادارانیان دەداتەوە، ئـەمـەش لە ڕێگەی لێکشیـتاڵکردنی "نیـــچـــە"وە دەکـات! چونکە ئەو ئەگـەر سـەرچاوەکـەی تێکوپێک دا ئەوا بە ئاسانی ئەو باڵانەی لێی بووەتەوە دەکەون و بەلادا دێن.

دەرچوونی ئەم کتێبە و کتێبگەلێکی تری لەم بابەتە، دابڕاو نییـە لە ڕەوتی گشـتـیی کۆمـەڵگەی فـرەنسـایی کە ئێسـتـا بەرەو ئارامی و سـەقـامگیـری و تەنانەت هەندێک جـار بەرەو کۆنسێرڤاتیڤیش دەچێت. ناونیشـانی ئەو کتێبە بەم شێوەیە: "بۆچی ئێمـە نیچەویی نین؟". ئـەمە کـتـێبێکی دەسـتە جـەمعییـە و لانی کەمی دە لە فەیلەسـووفانی نەوەی نوێ بەشدارییان تێدا کردووە. ئەمانە دەیانـەوێت خـۆیـان وەک نەوەیەکـی فـەلسـەفی جـیـاواز لـە نەوەی پێـشـوو بسەلمێنن، بەوەی خولیـا و ئاڕاستە و ئامانجی تایبـەت بە خۆیان هەیە. لێرەوە شتێکی سەیر نییە ئەوانە، بۆ نموونە بکەونە کێشەوە لەگەڵ لایەنگرانی "جاک دێریدا" یاخۆ "جیل دۆلۆز"دا. ئەمە شـەڕێکی فەلسەفی بچووکە کە لە پاریسدا ڕوو دەدات، بەڵام بێگومـان ڕەهەندی سیاسی و کۆمـەڵایەتیشی هەیە.

"ئەندرێ کۆنت سبۆنفیل" یەکێک لە بەشداربووانی نووسینی ئەو کتێبە، دەڵێت: «من بە نیچە و بلیمەتیی ئەو سەرسامم و لە چەند خاڵێکی فەلسەفیدا هاوڕام لەگەڵی، لەوانە: ڕەخنەگرتنی لە ئایدیالیزم و ئاین و ئازادیی هەڵبژاردن و ژیان دۆستی و.. هتد، بەڵام هەندێ مەسەلەی تریش هەن کە ناکۆکم پێیان و ڕێگەم پێ نادەن ببمە کەسێکی نیچەویی، لەوانە: نا ئەخلاقییەت و نا ئەقڵانییەت و نیشاندانی هونەر وەک ئەلتەرناتیڤی ئاین».

با بزانین مەبەست لە نا-ئەخلاقی "نیچە" چییە؟ وەکو دەزانین "نیچە" شانازی بەوەوە دەکات کە هەموو بەهاکانی ژێرەوژوور کرد."ئەمەش تایتڵی پرۆژە مەزنەکەی ئەوە" و پێویستە کتومت بڕوا بەو قسانەی بکەین. ڕاستە "نیچە" ستایشی توندوتیژی و ئیرادە و بەربەرییەت و ڕەگەزپەرستی دەکات، واتە ڕەتکردنەوەی سەرلەبەری دیموکراسی و بەهاکانی سەردەمی ڕۆشنگەری. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو ڕەتی دەکاتەوە ئەقڵ وەکو ئامرازێک، بۆ ڕزگارکردنی مرۆڤ لە دەست دواکەوتوویی و تاریکی و چەرمەسەری سەیر بکات. ئەم بۆچوونەش تەواو لەگەڵ ئەو گریمانە سەرەکییەیدا یەک دێتەوە کە دەسپێکی پرۆژە رەخنەییەکەیەتی: "ژێرەوژوورکردنی هەموو بەهاکان".

سەبارەت بە "نیچە"، "ئەندرێ کۆنت سبۆنفیل" دەڵێت: «یەکانگیرییەکی گەورە بە فیکری نیچەوە دیارە، بەڵام لە هەندێک وردەکاریدا ناکۆکی دەبینین. ڕەنگە ئەم قسانەم ناکۆک بن، بەڵام گەر بەوردی لە مەسەلەکان وردبینەوە، ئەو ناکۆکییە نامێنێت. لە ڕاستیدا ئەم ناکۆکییانەی ناو فیکری نیچە، دوا جار بە تۆکمەترکردنی پرۆژە فەلسەفییەکەی دەشکێتەوە.. ئێمە سەربارى ئەوەی مەسەلەی نا ئەخلاقییەت لای نیچە دەبینین، نا ئەقڵانییەتیش بەدی دەکەین. لەبەرئەوەی نیچە وەک دیاردەیەکی ڕووکەش و لاوەکی سەیری ئەقڵی دەکرد و لۆجیکی بە چەکی دەستی لاواز و بێدەسەڵاتەکان دەزانی، بۆیە هیچیانی بە پێویست نەدەبینی. لێرەوە

دەیتوانی زۆر بە ئاسانی و بە خواستی خۆی حوکمی ناکۆک و دژ بە یەک بدات، بێ ئەوەی بزانێت ئەوەی دەیڵێت وەک یەک نییە و پێک ناکۆکن.. من لەبەرئەوەی خۆم فەیلەسووفم و وەکو بەهایەکی بەنرخ سەیری ئەقڵ دەکەم، پێم وایە هیچ ئازادی و پێشکەوتن و مۆراڵێک ناتوانێت بەبێ ئەو بەرەو پێش بچێت، لەبەر ئەوە من ناتوانم نا ئەقڵانییەتی نیچە پەسند بکەم».

"ئەندرێ کۆنت سبۆنفێل" ژیرە و دەزانێت رەخنەکردنی نا ئەخلاقییەت و تاوانبارکردنی "نیچە" بە فەیلەسووفێکی نا ئەخلاقی بە شێوەیەکی رەها، کارێکی بێمانایە.. بۆیە ناتوانێت ئەوە لە بیر بکات کە "نیچە" سەرەوەختێک رەخنەی لە مۆراڵی ئاینی یەهوودی و مەسیحی و مۆراڵی تەقلیدی گرتووە، بەهۆی ئەوەوە بووە کە هەستێکی ئەخلاقی توند و تۆڵی هەبووە. "نیچە" بەهۆی ئەخلاق زۆرییەوە، بوو بە کائینێکی نا ئەخلاقی!.. هۆکارێکی مێژوویی دیاریکراو و تایبەتیش هەیە ئەوی ناچار کردووە، دژایەتی ئەو مۆراڵە بکات کە لە سەردەمی خۆیدا هەبووە.

هیچ فەلسەفاندنێک لە دەرەوەی مێژوودا نییە. "نیچە" لە بنەڕەتدا دژی ئایدیالیزم بوو، هاوکات دژایەتیکردنی بۆ ئەخلاقیش بەشێوەیەکی رەها نەبوو. سەبارەت بەم مەسەلەیە "ئەندرێ کۆنت سبۆنفیل" دەڵێت: «من لانی کەمی ئەم بۆچوونەم پێ پەسندە، چونکە فەیلەسووفە نا ئەخلاقییەکان بەشێوەیەکی گشتی بۆیە رەخنە لە ئەخلاق دەگرن، لەبەرئەوەی مرۆڤ دەچەوسێنێتەوە و ئازادییەکانی سەرکوت دەکات. هاوکات دژی ژیان و حەز و چێژ بینینە. رەخنەگرتنی نیچە لە ئەخلاق دژی هەموو ئەو شتانە بوو کە ئەخلاقی یەهوودی و مەسیحی هەڵگری بوون، وەک: سەرکوتکردنی هەموو غەریزە و ئارەزوویەک. دەرهەق بەم مەسەلەیە پێم وایە ئەو و فرۆید لەسەر هەقن و راستیان پێکاوە. بەڵام ئەو بەرەو پێشچوونەی ئەخلاق لە سەردەمی ئەمرۆدا و لە کۆمەڵگە ئەوروپاییە مۆدێرنەکاندا بەخۆیەوە بینی، کارێکی کرد ئەم کێشەیە پەراوێز کەوێت و وەکو دیاردەیەکی رابردوو سەیر بکرێت.

هەنووکە کاتێک ئێمە باس لە ئەخلاقی ناو کۆمەڵگەکانمان دەکەین، هەمان ئەو ئەخلاقە نییە کە لە ڕابردوودا چاودێری شتە وردەکانی ژیانی غەریزیمانی دەکرد. ئەمڕۆ ئەخلاق پێوەستە بە مەسەلەگەلێکی گرینگترەوە، وەک مەسەلەی سزادان و شەڕانگێزی. واتە هەموو ئەو شتانەی پێوەندی بە نێوانی ئێمە و ئەوانی ترەوە هەیە، لە ڕێزگرتن و پاراستنی مافەکانمان. بەڵام نیچە کاتێک ڕەخنە لە ئەخلاق دەگرێت، تەنیا هەر سەرزەنشتی ئەو لایەنە ناکات، کە سەرکوتی ژیانی تایبەتیمان دەکات، بگرە سووکایەتیش بە ئایدیای ڕێزگرتنی بەرامبەریش دەکات، واتە دیموکراسیش بە چاوێکی سووک سەیر دەکات، چونکە بە بۆچوونی ئەو ئەخلاقی ڕێزگرتنی بەرامبەر ئەخلاقی کۆیلەیە.. بەڵام ئێمە لێرەدا پێی دەڵێین: «نا ئێمە لەگەڵ ئەم بۆچوونەی تۆدا نین، چونکە ئێمە هەموو تێکەڵکردنێک لە نێوان ئەخلاق و ئەخلاقچێتیدا ڕەت دەکەینەوە».

## فۆكۆ و مۆدێرنه

لێرەدا دەخوازم هەندێک لایەنی ئەو مشتومڕە فیکرییە بخەمە ڕوو کە لە کایەی ڕۆشنبیریی فرەنسایی و تەنانەت جیهانیشدا، سەبارەت بە "میشێل فۆکۆ" دروست بوو. وەکو ئاشکرایە نێوبانگی ئەم فەیلەسووفە دنیای گرتەوە و خەڵکانێکی زۆریشی بەخۆیەوە خەریک کرد، ئەگەرچی هەنووکە کەم تا کورتێک ئەو هەڵلایەی لە دەور نەماوە و چووەتە دواوە. "فۆکۆ" نێوبانگی بەو ڕەخنە توندانە دەرکردبوو کە ئاراستەی شارستانییەتی خۆرئاوای دەکرد و دەستنیشانی کەموکوڕی و خاڵە لاوازەکانی ئەو شارستانییەتەی دەکرد، هەروەها ئەو پێوەندییە توندوتۆڵ و ترسناکەشی ئاشکرا کرد- کە لە نێوان مەعریفە و دەسەڵاتدا هەیە.

لەم سەروبەندەشدا نیشانی دا مەعریفە هێندە بێگوناه نییە وەکو ئەوەی ئێمە مەزەندەی دەکەین، بگرە ئەوە مەعریفەیەکە دەسەڵات بەرهەم دێنێت و تەنانەت هەندێ جاریش مەشرووعییەت دەداتە دەسەڵاتی سەرکوتکەر. هەروەها ڕەخنەی لە سەرجەم ئەو داوودەزگایانەش گرت کە لە دوای سەردەمی ڕۆشنگەرییەوە لە خۆرئاوادا دروست بوون. ڕەخنەکانی "فۆکۆ" بە جۆرێک بوون، خەڵک وایان دەزانی دژایەتی ڕۆشنگەری و مۆدێرنە دەکات، ئەمەش بۆ خۆی ناهەقییەکی گەورەیە. بۆ ئەوەی ئەم مەسەلەیە ڕوون بکەینەوە، ئەوا بایەخ بە دید و بۆچوونەکانی "ژاک بۆڤرێ" و پێوەندی ئەو بە "فۆکۆ" و ئاقاری پۆست مۆدێرن دەدەین. وەک دەزانین "ژاک بۆڤرێ" لە ئێستادا، یەکێکە لە فەیلەسووفە دەگمەنەکانی فرەنسا و مامۆستای فەلسەفەی مۆدێرنە لە کۆلێجی دی فرانس و پسپۆرێکی دیاری فەلسەفەی

شیکاری ئەنگلۆ ساکسۆنیشە، بە تایبەت فەلسەفەی "ڤیتگنشتاین".

"بۆڤریێ" دەقگەلێکی "ڤیتگنشتاین"ی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فەرەنسایی و چەندین کتێب و لێکۆڵینەوەشی لە بارەوە نووسیوە، بەمەبەستی شرۆڤەکردن و ئاسان وەرگرتنی لەلایەن خوێنەرانی فەرەنساوە. هەر کاتێک باسی "ژاک بۆڤریێ" دەکرێت، دەستبەجێ ناوی "ڤیتگنشتاین"یش دێت، لەبەرئەوەی ماوەیەکی زۆر بە فیکر و جیهانبینیی ئەوەوە خەریک بووە، بەڵام لە چەند ساڵی دواییدا وازی لەو خولیا سەرەکییەی خۆی هێناو دوو کتێبی لەسەر مەسەلەی ئاقاری هیومانیزم لە فیکری ئەورووپاییدا بە ناوی "فەیلەسووف لای ئەوانەی خۆیان دەخۆن" و "ئەقڵانییەت و درێوی" بە چاپ گەیاند. لە هەردوو ئەو کتێبەدا هێرشێکی توندی کردووەتە سەر فەیلەسووفانی پۆست مۆدێرنەی فەرەنسایی، ئەمانەش ئەو فەیلەسووفانەن کە تاوانبار کراون بەوەی ڕەواج بە نائەقڵانییەت و سۆفیستائییەت و پووچگەرایی دەدەن، لە فەرەنسا بەتایبەتی و لە خۆرئاواشدا بە گشتی. ئەمانە وەکو کەسانی بێ ئومێد درانە قەڵەم و هێرشکردنی زۆریشیان بۆ سەر بنەماکانی شارستانییەتی ئەورووپی وەک: "دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ و هیومانیزم"، بووە مایەی بێزاریی زۆری ئەو فەیلەسووفە ئەقڵانییانەی داکۆکی لەم بەهایانە دەکەن و "ژاک بۆڤریێ"ش یەکێکە لەوانە.

لێرەدا جێی خۆیەتی ناوی ئەو فەیلەسووفانە بهێنین کە لە شارستانییەت و مۆدێرنە داخ لە دڵن، نموونەکانیان وەک: "ژاک دێریدا، میشێل فۆکۆ، ژێڵ دۆلۆز، ژان فرانسوا لیوتارد". ئەمانە هەرایەکی گەورەیان لەسەر مۆدێرنە و بەهاکانی نایەوە، نەک بە تەنیا لە وڵاتی فەرەنسادا، بگرە لە ئەڵمانیا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و لەسەر ئەم بابەتەش مشتومڕی گەرم، لە نێوان فەیلەسووفانی ئەڵمانی و فەرەنسایی و ئەمەریکاییەکاندا دروست بوو. بەپێی ئەوەی لە پاشکۆی ئەدەبیی ڕۆژنامەی "لیفیگارۆ"دا هاتووە، پاش دە ساڵ لە مردنی "میشێل فۆکۆ" و "فۆکۆ لە ٢٤ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٤ لە

پاریس و بە نەخۆشی ئایدز کۆچی دوایی کرد. وەرگێڕ" دوای ئەو هەموو ڕەخنەیەشی ڕووبەڕووی بووە، بەڵام تا ئێستاش بە گرینگترین فەیلەسووفی هاوچەرخی فرەنسایی دادەنرێت. لە ئەمەریکادا زۆرترین خوێنەری هەیە و زیاد لە هەر فەیلەسووفێکی تر کۆڕ و سیمینار و کۆنگرەی زانستی بۆ ساز دەکرێت. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە چ شوێن دەستێکی لەسەر کایەی فەلسەفیی خۆرئاوا و جیهانی جێ هێشتووە، ئەگەرچی لە چەند ساڵی ڕابردوودا خەریکە ئەستێرەی بەختی لە کزی دەدات. ڕەنگە بۆ ئێمە شتێکی سەیر و سەمەرە بێت کە چۆن فەیلەسووفێکی وەکو "فۆکۆ"، تەواوی تەمەنی خۆی بۆ ڕەخنەکردنی مەزنترین ژیاری سەر گۆی زەوی تەرخان کردووە، یان چۆن دەبێت بیریارە مەزنەکانی ئەورووپا شاڵاو بەرنە سەر مۆدێرنە و ئەقڵانییەت؟!

ڕەخنەگرتن لە مۆدێرنە و ئەقڵانییەت، لە شەستەکانی سەدەی ڕابردووەوە لە فرەنسادا دەستی پێ کرد و بزاوتێکی فەلسەفیی وەهاشی لێ کەوتەوە کە لانی کەم بۆ ماوەی چارەکە سەدەیەک پاوانی گۆڕەپانەکەی کردبوو، بەڵام لە چەند ساڵی دواییدا پەرچەکردارێکی بەهێز لە بەرامبەریدا دروست بوو. لێرەدا هەوڵ دەدەین لە ڕێی خستنەڕووی هەندێک بیر و بۆچوونی بیریارێکی ئەقڵانی و لۆجیکی وەک "ژاک بۆڤریێ"وە، نموونەی ئەو پەرچەکردارە نیشان بدەین. "ژاک بۆڤریێ" پێی وایە بەرنامەی سەرەکیی سەردەمی ڕۆشنگەری بریتی بووە لە: ڕووناککردنەوەی ئەقڵی مرۆڤ و زیادکردنی توانستی زانینی، بۆ ئەوەی توانای کۆنترۆڵکردنی سروشت و شتەکانی زیاتر بێت.

فەیلەسووفانی ڕۆشنگەری پێیان وابوو، ئەمە دەبێتە مایەی ئەوەی حاڵی مرۆڤ زۆر باشتر بێت و زیاد لە جارانیش بەختەوەرتر و خۆشگوزەرانتر بێت. سەردەمی ڕۆشنگەری پێی وابوو سەرچاوەی نەهامەتی لە جیهاندا نەزانینە، چارەسەری ئەمەش تەنیا بە زانست و زانین دەکرێت. دوژمنی تاریکی ڕووناکییە و زانستیش دوژمنی نەزانینە. کەواتە ڕامالینی نەزانین و

خورافات، تەنیا بە رووناکیی زانست و ئەقڵ دەستەبەر دەبێت. هاوکات فەیلەسووفانی ڕۆشنگەری شەڕێکی بێوادەیان لە دژی دەمارگیری ئاینی و تاریکخوازی فێندەمێنتالیزم کرد. ئەی کەواتە فەیلەسووفانی پۆست مۆدێرن ڕەخنە لە چی دەگرن و ڕەخنەکانیان چییە؟ ئایا دەیانەوێت بگەڕێینەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست؟

فەیلەسووفانی پۆست مۆدێرن باس لەوە دەکەن کە ئەقڵانییەتی سەرمایەداریی بیرۆکراسی، سەرجەم بوارەکانی ژیانی لە کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا پاوان کردووە و ئەمەش بە مەترسییەکی گەورە دەزانن. ئەمە لە کاتێکدا تەواوی میللەتانی دنیا ئیرەیی بە گەلانی ئەورووپایی دەبەن. "ژاک بۆڤرێ" پێی وایە ئەوانەی ڕەخنە ئاراستەی مۆدێرنە دەکەن تەنیا لە خاڵێکدا ڕاستییان پێکاوە، ئەویش ئەوەیە کە پێشکەوتنی بێحەد و حیسابی زانست و تەکنۆلۆجیا بۆ خۆی بووەتە ئامانجێک، لە کاتێکدا دەبوو ئامرازێک بێت بۆ خزمەتکردن و بەختەوەرکردنی مرۆڤ.

لێرەدا ئەوانەی ڕەخنە ئاراستەی مۆدێرنەی تەکنۆلۆجی دەکەن، کارێکی بەجێ دەکەن. بەڵام نابێت ئەم ڕەخنەگرتنە بگاتە ئاستی ئافەرۆزەکردنی کۆی شارستانییەتی خۆرئاوا و سنوور ببەزێنن، چونکە ئەمە هەڵوێستێکی پەرگیرانە و لە باشترین حاڵەتیشدا هەڵوێستێکی نا مەسئوولانەیە. بێگومان پێشکەوتنی زانستی و تەکنۆلۆجی لە خۆرئاوا، هاوشانی پێشکەوتنی ئەخلاقی و ڕۆحی و دانایی نەبوو. مرۆڤ گەیشتووەتە ئاستێک پێداویستییەکانی ئاراستەی دەکەن، نەک ئەو ئاراستەی پێداویستییەکانی بکات. لە سەردەمی ڕۆشنگەرییەوە تا ئەمڕۆ "کە نزیکەی دووسەد ساڵێک دەکات"، مەعریفەی مرۆڤی ئەورووپایی زۆر زیادی کردووە، بەڵام ئاخۆ بە هەمان ئەو ڕادەیەش دانایی و جڵەوکردنی چارەنووسی خۆی زیادی کردووە؟

داهێنان سنووری بۆ نییە و پێداویستییەکانیش لە ئاستێکدا ناوەستێت،

بۆیە پێویستە مرۆڤ بزانێت لە چ سنوورێکی دیاریکراودا ئەو پێداویستییانە ڕابگرێت و زیادەڕۆیی نەکات. قەیرانی شارستانییەتی مۆدێرنیش لێرەدایە. هەموو ئەم شتانەی باس کران ڕاستن و "ژاک بۆڤریێ"ش لاری لێیان نییە، بەڵام ئەو پێی وایە فەیلەسووفانی نائەقڵانی وەک: "دێریدا و فۆکۆ و دۆلۆز و لیوتارد"، لە ڕەخنەگرتنی مۆدێرنەدا زۆر دەڕۆن و ئاستێک بۆ ڕەخنەکانیان دانانێن. ئەمانە مۆدێرنە وەک دیاردەیەکی بەد و خراپەکاری دەبینن. بریا هەڵوێستێکی حەکیمانەیان لە مۆدێرنە وەرگرتایە، وەک ئەوەی "مونتێن" وەری گرت. بابزانین "مۆنتێن" دەڵێت چی؟ ئەو پێی وایە: "بەڕاستی زانست شتێکی مەزنە و ئەوانەشی تەرێزی لێ دەکەن یاخۆ بە هێند وەری ناگرن، نەزانین و بیرتەسکیی خۆیان نیشان دەدەن.. ڕاستە زانست چارەسەری هەموو شتێک ناکات، بەڵام شتێکی سەرەکییە بۆ پێشکەوتنی مرۆڤ".

لە ڕۆژگاری "مۆنتێن"ەوە تا ئەمڕۆ "کە چوار سەدە دەکات"، مرۆڤی ئەورووپایی پەندی زۆر و زەوەندی دەرهەق لەلایەنی پۆزەتڤی و نێگەتیڤی زانست وەرگرتووە. ئەو مرۆڤە زانستی ئەزموون کردووە و بەرهەمەکانی چنیوەتەوەو باجیشی داوە "ڕاستە زانست ئەقڵی ئەلکترۆنی بەرهەم دێنێ، بەڵام بۆمبی ئەتۆمی و چەکی کیمیاویش بەرهەم دێنێ کە قەلاچۆی مرۆڤایەتی دەکات". کەواتە هەموو شتێک پێوەندی بەوەوە هەیە، چۆنچۆنی زانست بەکار دێنین. یان ئەوەتا بۆ چاکەی بەکار دەهێنین، یان لە پێناو خراپەدا بەگەڕی دەخەین. لەلایەکی ترەوە تەرێزکردن لە زانست لە لایەن فەیلەسووفە نائەقڵانییە هاوچەرخەکانەوە، دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەریی "نیچە" و هەڵوێستی نیگەتیڤانەی ئەو لە زانست. "فۆکۆ" و ئاقاری پۆست مۆدێرن، جەخت لەسەر لایەنی هەیمەنە و کۆنترۆڵ دەکەنەوە کە پێوەستن بە زانستەوە و لایەنی مەعریفی پرۆژەی سەردەمی ڕۆشنگەری وەلاوە دەنێن.

ڕاستە زیادبوونی زانین دەبێتە مایەی ئەوەی زیاتر دەسەلاتمان بەسەر

شتەکاندا و سروشتدا بشکێت، وەکو ئەوەی "دیکارت" خەونی پێوە دەبینی، بەڵام ئەمە بۆ خۆی وەکو پرۆژەیەکی نموونەیی دەمێنێتەوە و پاساوی ئەوەمان بۆ ناداتەوە کە مەعریفە کورت کەینەوە بۆ تەنیا ئامرازێکی هەژموونخوازی و و کۆنترۆڵکردنی ئەوانەی تر. بێگومان پرۆژەی زانستی و تەکنۆلۆجی خۆرئاوایی، بووە مایەی ئەوەی خۆرئاوا دەسەڵات بەسەر میللەتانی تردا پەیدا بکات، بەڵام زانست هەمووی دەسەڵات و چەوساندنەوە و بە کۆیلەکردن نییە، وەکو ئەوەی رەخنەگرانی مۆدێرنە باسی دەکەن.

دەکرێت ئێمە لەمڕۆدا سەرکۆنەی "دیکارت و گالیلۆ و نیوتن و کانت و ئەنیشتاین" بکەین، تا ئەوانەی پێ رازی بکەین کە دەیانەوێت تەواوی شارستانییەتی مۆدێرن ئافەرۆز بکەن؟! ئێمە دەتوانین رەخنە لە ئایدیۆلۆجیای زانستی بگرین و لە هەمان کاتیشدا، لایەنە پۆزەتیڤ و دەسکەوتە گرینگەکانی زانست بپارێزین کە مرۆڤیان گەیاندە ئەو ئاستە بەرزەی پێشکەوتن."ژاک بۆڤرێ" دەیەوێت بە فەیلەسووفانی پۆست مۆدێرن بڵێت: «دەکرێت رەخنە لە کەموکورییەکانی مۆدێرنە بگرین، بەڵام ناکرێت زانست و شارستانییەتی تەکنۆلۆجی سەرلەبەر رەت کەینەوە». ئەوەی جێی سەرنجە ئەوەیە، رەخنەگرانی مۆدێرنە لە سەنگەری چەپڕەوەکان و تەنانەت چەپڕەوە توندڕۆیەکانی فرەنسادان، بەڵام ئەمە شتێکی زۆر سەیر نییە و بە تاقیکردنەوە دەرکەوتووە کە لە دواجاردا چەپی توندڕۆ و ڕاستی توندڕۆ یەک دەگرن و دەبن بە یەک، چونکە هەردووکیان دوژمنی دانایی و میانڕەوی و سەنگینین.

"ژاک بۆڤرێ" جارێکی تر دەگەڕێتەوە سەر ئیدانەکردنی "نیچە" و بەرپرسیاریەتی ئەو ئاقارە نائەقڵانییەی دژایەتی مۆدێرنە و دەسکەوتەکانی دەکات، دەخاتە ئەستۆی ئەو.. لەم بارەیەوە "ژاک بۆڤرێ" دەڵێت: «نیچە بیەوێت یان نا ئەوا تیۆریاکەی ئەو کە پێوەندی بە ئیرادەی هێزەوە هەیە، ڕێی خۆش کرد بۆ ئەوەی فاشیزمی ئەڵمانی جارێکی تر بێتەوە مەیدان..

نیچە وتەزای ئیرادەی هێزی کردە بنەمای بوون و زیندەگی و نازیزمیش بڕوای بە تێزەکانی نیچە هێنا و لە هەوڵی ئەوەدا بوو لە واقیعدا کاری پێ بکات. سەرەنجامیش بەو ماڵوێرانییە کۆتایی هات کە هەموومان دەیزانین. ڕاستە نیچە بەرەنجامێکی وەهای نەدەویست، بەڵام بیر و بۆچوونە توندڕۆکانی ئەوەی لێ کەوتەوە. هەندێک جار بیریار شتێکی دەوێت، کەچی بیر و بۆچوونەکانی بۆ بەدەستهێنانی شتی تر بەکار دەهێنرێت».

خاڵێکی تر کە خەسڵەتی بیریارانی پۆست مۆدێرنە و "ژاک بۆڤریێ" ڕەخنەی لێ دەگرێت، ئەوەیە: «ئەوان هەموو دەسەڵاتێک ڕەت دەکەنەوە و لە هەموو دەسەڵاتێکیش نارازین، وەک ئەوەی هەڵوێستێکی وا لە پۆخڵی دەسەڵات بیانپارێزێت، چونکە ئەوان پێیان وایە دەسەڵات خراپەکارە و هەر ڕۆشنبیرێکیش مامەڵەی لەگەڵدا بکات تاوانبارە. بێگومان ئەمە هەڵوێستێکی دروست نییە و ئاکامی باشیشی نابێت. ڕۆشنبیر دەبێت دەسگیرۆیی دەسەڵات بکات گەر هاتوو پرۆژەی باشی بۆ کۆمەڵگە ئەنجام دا، هەروەها پێویستە کاتێک هەڵە دەکات ئاگەداری بکاتەوە، بۆ ئەوەی هەڵوێستی خۆی ڕاست بکاتەوە و بڕیاری گونجاو دەربکات».

بەڵام فەیلەسووفانی پۆست مۆدێرن شانازی بەوەوە دەکەن کە بە بەردەوامی دژایەتی دەسەڵات دەکەن. لێرەدا "ژاک بۆڤریێ" بەراورد لە نێوان هەڵوێستی پۆست مۆدێرنەکان و ڕاستی توندڕۆدا دەکات کە دژایەتی بەهاکانی پێشکەوتن و دیموکراسی و مۆدێرنە دەکەن. هەندێک جار پۆست مۆدێرنەکان دەگەنە شتێک کە پێچەوانەی خواستی ئەوانە. بۆ نموونە کاتێک "فۆکۆ" دەڵێت: «ئەقڵ ئامرازێکی سەرکوتکەرە!»، ئەوا بێ ئەوەی بەخۆی بزانێت بۆ خاتری بەرژەوەندی هێزە کۆنسێرڤاتیڤ و دواکەوتووەکان کار دەکات. بەڵام بۆچی "فۆکۆ" وا دەڵێت؟ لەبەرئەوەی ئەو پێی وایە ئەقڵ شتەکان لە چوارچێوەی سیستمێکی دیاریکراودا ڕێک دەخات، هەر ڕێکخستنێکیش بە مانای سڕینەوەی هەندێ شت و دەست لێ نەدان و

هێـشـتنەوەی هـەندێکی تـرە. لێـرەوە هـەمـوو ڕێکخـسـتن و دیسـپلینێک، بە ناچاری پرۆسـەی سـەرکوتکردن لە خـۆ دەگـرێت. کەواتە ئەقڵ هـەرچییـەک بکات سەرکوتکارە.

لێرەدا توندڕۆیی "میشێل فۆکۆ" بە زەقی دیارە. ئەڵبەتە ئەو مافی خۆیەتی کاتێک ڕەخنە ئاراسـتەی ئەقڵی کلاسیکی خۆرئاوا یان ئیـرۆسەنتـەریزم دەکات، بە تایبەت لەو دۆخەی ئێستایدا کە بەسـەرخۆیدا داخراوە و نایەوێت بەسـەر جیهانی دەرەوە و کولتوورەکانی تردا بکرێتەوە. ئەقڵی ئەورووپایی لە قـۆناغی کـۆلۆنیـالیـزم و پۆزەتـڤـیـزمـداو بە درێژایی سـەدەی نۆزدەم و تا ناوەڕاسـتی سـەدەی بیـسـت (واتە بەر لە دروسـتـبـوونی قـوتابخـانەی فـرانکفـۆرت کـە پێش کـتێـبـە بەناوبانگەکەی فـۆکـۆ مـێژووی دێوانـەیی لە سـەردەمی کـلاسـیکیـدا زۆر بە توندی کـەوتنە سـەرکـۆنەکـردنی ئـەقڵ)، دووچاری ئـەو حـاڵەتە بـوو، بەڵام نـابێت پـرۆسـەیەکی ڕەخنەیی لەو جـۆرە زیادەڕۆیی بکات و تەواوی دەسکەوتە پۆزەتیڤەکانی ئەقڵی لیبراڵیزم وەلاوە بنێت، چونکە کـارێکی لەو جـۆرە نـاهەقـیـیـە دەرهـەق بە ئـەقڵ و ئـەو شارستـانییەتە قەشـەنگەی بەرهـەمی ئەقڵە. تایبەتمەندییـەکی تری بیریارانی پۆست مۆدێرن نارەزایی دەربڕینی بەردەوامە و ڕەخنەکردنی هـەمـوو ڕێسا و پێـوەدانگێکە، ئەمـەش بە ناوی ئازادییـەکـەوە کـە هـیچ سنوورێک ناناسـێت. ئەمانە ئەلتەرناتیڤیان پێ نییە و کاری سەرەکییان ڕەخنە و لێکشیتاڵکردن و وێرانکردنە بەشێوەی "نیچە".

"نیـچـە" پێـی وابوو تەنانەت زمـانیش برێتییـە لە زیندانێک، لەبەرئەوەی لە چوارچێوەی سیستـمی ڕێکخستنی وشـەکان بەشێوەیەکی دیاریکراو، مـانا ئازادەکان کـۆت و بەند دەکات. بـەڵام هیچ زمـانێک لە دنیـادا هـەیە بتـوانێت بەبێ ڕێزمـان دروست ببێ؟ "نیـچـە" وەڵامـی ئەم پرسـیـارە ناداتەوە و تەنیـا ئەوە دەڵێت کە "زمان زیندانـی مانایە". فـەیلەسووفـانی پۆست مـۆدێرنەش لە فرەنسا لەسـەر هـەمـان ڕیتمی ئەوە کە دەڵێن: "ئەقڵ زیندانە!". ئەوان لەوەدا

ڕاست دەکەن، ئەگەر ئەقڵ بووە بەستەڵەک و لە زانست و کرانەوەی شارستانی دواکەوت، ئەوا دەبێت بە کۆت و بەند و زیندانێکی گەورە. بەڵام خۆ هەر ئەقڵە کە بنەما و بڕبڕەی پشتی شارستانییەتە و ناکرێت بەو ڕەهاییە سەرکۆنەی بکەین و ڕەتی بکەینەوە. مەترسییەکەش لێرەدایە.

ئەقڵ خاوەنی مێژووە و لەگەڵ تازەبوونەوەی زانست و داهێنانی مەعریفی و ئەزموونی مێژوویی و پێشهاتە میتۆدییەکاندا، تازە دەبێتەوە. ئەقڵ وەکو ئەوەی ئێمە مەزەندەی دەکەین شتێکی نەبزۆک و پێدراوێکی نەگۆڕ نییە، بگرە وەکو تەواوی شتەکانی تر مێژووی خۆی هەیە. لەبەر ئەم هۆیەشە کە باس لە "ئەقڵی دیکارتی و ئەقڵی کانتی و ئەقڵی دیالەکتیکی هیگڵی و.. هتد" دەکەین. ئەقڵ بە بەردەوامی پەرە دەستێنێ و دەگۆڕێ و خۆی نوێ دەکاتەوە.

دواجار "ژاک بۆڤرێ" دەیەوێت حوکمێکی توند بەسەر "فۆکۆ" و "دۆلۆز"دا نەدات و نایەوێت خواستی ڕاستگۆیانەی ئەوان، بە مەرامی توندڕۆ و پڕ لە بوغزی ڕاستی فرەنسایی تێکەڵ بکات کە بەرامبەر بە مۆدێرنە و سەردەمی مۆدێرن هەیانە، چونکە "بۆڤرێ" لە هەوڵ و کۆششی "فۆکۆ" و "دۆلۆز" لە پێناو مەسەلە ئینسانییەکاندا ئاگەدارە، بەتایبەت ئەو خۆپیشاندانانەی لە پێناو مافی کرێکارە بیانییەکانی ناو فرەنسادا پێی هەستان.. هەروەها داکۆکیکردنیان لە مافی کەمایەتییە چەوساوەکانی ناو کۆمەڵگەی فرەنسایی. بەڵام پەرگیری ئەوان لەسەر ئاستی تیۆری دژ بە ژیاری خۆرئاوایی کە لەسەر بنەمای مافی مرۆڤ و ڕێزگرتنی فرەڕەنگی و گەمەی دیموکراسی دامەزراوە، ناکۆکە لەگەڵ ئەو پرۆسەیەی ئەوان دەستیان داوەتێ و لە بەرژەوەندیی کێشەی مرۆڤە زۆر لێکراوەکاندایە، واتە لە بەرژەوەندی مافەکانی مرۆڤدایە بەگشتی. کەواتە چۆن دەبێت ئەوان لە ڕووی تیۆرییەوە گاڵتەیان بە جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ بێت و بە عەمەلیش بەرگری لێ بکەن؟ ئەم ناکۆکییە زەق و دژوارە جێ سەرنجی بیرمەندگەلێکی

تری وەک "لۆک فێری و ئالان ڕینۆ" بووە.

هەموو ئەوەی لە سەرەتاوە باسمان لێ کرد، دەری دەخات کە ئەقڵانییەت مەرج نییە تەنیا خواستی هەژموونخوازی و سەرکوتکردن و شەڕانگێزی و وێرانکردن بێت، وەک ئەوەی ڕەخنەگرانی مۆدێرنە باسی دەکەن. هەروەها مەرج نییە نائەقڵانییەت لێبووردە و لیبراڵی و بێوەی بێت یاخۆ ڕێزی سروشت و ژینگە و ژیان بگرێت، وەکو ئەوەی ئەوان پێیان وایە.

"ژاک بۆڤرێ" لە درێژەی قسەکانیدا لەسەر "میشێل فۆکۆ" و هەڵوێستی ئەو لە مۆدێرنە، کۆ لەوە ناکات باس لە گرینگیی ئەو بکات وەک بیریارێک کە ڕۆڵی لە دەستنیشانکردنی کەموکورییەکانی شارستانییەتی خۆرئاوا و کۆمەڵگە لیبراڵییەکاندا هەبووە. بەڵام سەری لەوە دەسڕمێت کە چۆن بیریارێکی بلیمەتی وەکو ئەو لە ڕووی میکانیزمەکانی سەرکوتکردن و کۆنترۆڵ و سزاوە، بەیەک چاو سەیری سیستەمە کۆمۆنیستییەکان و سیستەمە لیبراڵییەکان دەکات. لە نێوانی ئەم دوو سیستەمەدا جیاوازییەکی جەوهەری هەیە. ئەگەر چی کەموکوڕی لە کۆمەڵگە لیبراڵییە دیموکراسییەکاندا هەیە، بەڵام ناکرێت بەو سیستەمە دیکتاتۆرییانە بەراورد بکرێت کە ئازادیی بیرکردنەوە و ڕادەبڕین و ڕۆژنامەوانی و.. هتد، تێدا نییە. لەم ڕووەوە "فۆکۆ" و بەر لەویش "ژان پۆڵ سارتەر"، کەوتنە هەمان هەڵەوە.

هەندێک پێیان وایە پێوەندیکردنی "فۆکۆ" و "سارتەر" بە ڕیزەکانی چەپی توندڕۆوەوە لە شەست و حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا، فەرەنسای لە دەست ئەو شەپۆلی تیرۆرە قوتار کرد کە ڕووی تێ کردبوو. گەر هەوڵی ئەوان نەبوایە و جڵەوگیری ئەو هێزە ڕادیکالە توندڕۆیانەیان نەکردایە لە ڕێی پێوەندیکردن پێیانەوە، ئەوا فەرەنسا ڕووبەڕووی چارەنووسێکی دژوار دەبووەوە. بە سەلماندنی ڕاستیی ئەم قسانەش، دەتوانین نموونەی ئەڵمانیا

بهێنینەوە کە لە هەمان سەردەم و زەماندا توند وتیژی تێیدا تاوی سەند، هۆکەشی ئەوە بوو بیریارانی ئەڵمانیا نەیانتوانی ئەو هێزە ڕادیکالانەی ناو کۆمەڵگەی خۆیان کۆنترۆڵ بکەن و ڕێ لە توندڕۆییان بگرن. ئەم مەسەلەیە گرینگە و ئەوە دەهێنێت قسە و باسی لەسەر بکرێت. تەواوی کۆمەڵگە ئینسانییەکان هێزی نا ئەقڵانی تێدایە و گەرهاتوو ئەم هێزە نەیتوانی لە ڕێگەی کەناڵە سروشتییەکانەوە گوزارشت لە خۆی بکات، ئەوا دەست دەداتە توندوتیژی و غافڵکوژی و هاوسەنگیی کۆمەڵگە دەکەوێتە بەر هەڕەشە و مەترسیی تێکچوون.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە بیریاری ڕەخنەیی - وەکو سارتەر و فۆکۆ -، یارمەتی کۆمەڵگە دەدات بۆ ئەوەی خۆی لە هەموو توندڕۆییەک خاڵی بکاتەوە،- ئیتر ئەمە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ-. هەرچەندە ڕۆشنبیری ڕەخنەیی دەوڵەت پەست و بێزار دەکات، بەڵام زیاد لە ڕۆشنبیری ملکەچ و گوێ لە مشت خزمەت بە دەوڵەت و کۆمەڵگە دەکات. بەڵام کێشەکە لێرەدا ئەوەیە "فۆکۆ" لە ڕەخنەکردنی داوودەزگاکانی کۆمەڵگەی لیبراڵیدا، هەموو سنوورێکی بەزاندووە و تەنانەت کار گەیشتووەتە ئەوەی بنەماکانی دیموکراسی خۆشی بخاتە مەترسییەوە و سیستمی دیموکراسی و سیستمە سەرکوتکارە کۆمۆنیستییەکانیش وەک یەک سەیر بکات. ئەمەش شتێکی نا دروستە و خاڵی لاوازیی سەرەکیش لە فیکری ئەودا لێرەدایە.

ئەگەر "ژاک بۆڤرێ" زیاتر جەختی لەسەر لایەنی نائەقڵانی فەلسەفەی "میشێل فۆکۆ" کردبێت، ئەوا "لۆک ڤێری و ئالان ڕینۆ" بایەخیان بەو لایەنە داوە کە چۆن "فۆکۆ" دژایەتی هیومانیزمی خۆرئاوایی کردووە، ئەمەشیان لەو کتێبەدا باس کردووە کە ساڵێک پاش مردنی "فۆکۆ" واتە ساڵی ١٩٨٥ بڵاو بووەوە. ئەم کتێبە لەگەڵ بڵاوبوونەوەیدا، بوو بە ئینجیلی هەموو ئەوانەی دژایەتی "فۆکۆ و دۆلۆز و دێریدا" یان دەکرد. مەبەستی هەر دوو

نووسەر لەم کتێبەیاندا ئەوە بوو، ئەفسانەی "میشێل فۆکۆ" لە کایەی فەلسەفەی فرەنساییدا تێکوپێک بشکێنن.

وەکو ئاشکرایە "فۆکۆ" بە درێژاییی چارەکە سەدەیەک دیارترین ناوی فەلسەفەی فرەنسایی بوو، تەنانەت گرینگترین ناوی ناو فەلسەفەی جیهانیش بوو، چونکە شۆرەت و نێوبانگی گەیشتبووە وڵاتانی تری دنیا و بە تایبەتی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

"لۆک فیری و ئالان ڕینۆ" لە کتێبەکەیاندا: "فیکری ٦٨"، دەیانەوێت ئاستێک بۆ فیکر و بیر و بۆچوونەکانی "فۆکۆ" دابنێن. فیکری ٦٨، واتە ئەو فیکرە کۆمەڵایەتییە تووڕەیەی هاوشانی شۆڕشی ئایاری ٦٨ بوو لە فرەنسا و ویستی وابوو سیستمی سەرمایەداری ژێرەوژوور بکات. نوێنەرانی فیکری ٦٨ سەر بە چەندین ئاقاری جیاجیا بوون:

- ئاقاری مارکسیزم، لوی ئەڵتۆسێر.
- ئاقاری نیچەوی، میشێل فۆکۆ.
- ئاقاری هایدگەری، ژاک دێریدا. لەگەڵ "ژێل دۆلۆز" و "پییربۆردیۆ"و.. هتد.

سەرەڕای ئەوەی ئەو بیرمەندانە لەگەڵ یەکتریدا ناکۆکن، بەڵام هەموویان لە سەر یەک شت کۆک و تەبان، ئەویش ئیدانەکردنی ئەو فەلسەفە هیومانستییەیە کە لە سەدەی نۆزدەمەوە تا ئەمڕۆ لە خۆرئاوادا باڵا دەستە. بەهێزترین گوزارشت لەم ئیدانەکردنە ئەوەیە کە "فۆکۆ" لە کۆتایی کتێبی "وشەکان و شتەکان"دا باس لە مەرگی مرۆڤ دەکات. مەبەستی لەوەش کۆتایی فەلسەفەی هیومانستی خۆرئاوایی بوو.

لێرەدا جێی خۆیەتی بپرسین، ئایا فەلسەفەی هیومانیزم ڕاستگۆیی خۆی لە دەست داوە؟

ڕەنگە ئێمە لە هەڵسەنگاندنی فیکری ئەوروپاییدا بە هەڵەدا بچین.

بەداخـەوە ئەوەی لـە ئێـسـتـادا ڕوو دەدات بەو جـۆرەیە، لەبـەرئـەوەی زۆربەی ئەوانەی فیکری خـۆرئاوامـان بۆ دەگوازنەوە، بە باشی تێی نەگـەیشـتـوون و بەشێوەیەکی دروست بۆمانی ناگوازنەوە، ئەمەش وا دەکات پێوەندیی فیکری لەگـەڵ خـۆرئاوادا کـارێکی مـەحـاڵ بێت. "فـۆکـۆ" کـاتێک دەڵێت: «مـرۆڤ لە کولتووری خۆرئـاواییدا داهێنانێکی تازە وەختە و تەمـەنی لە سەدە و نیوێک تێناپەڕێت»، ئێمە تووشی شۆک و سەرسـڕمانێکی گەورە دەکات، لەبەرئەوەی مـرۆڤ لە دێرزەمـانەوە لەسـەر گـۆی زەوی نـیـشـتـەجـێـیـە.. بەڵام "فـۆکـۆ" مـەبەستی ئەوەیە مـرۆڤ تەنیـا لە کۆتایی سـەدەی هـەژدە و سـەرەتای سـەدەی نۆزدەمدا "ساتەوەختی کانت و دابڕانی ئەبستـمـۆلۆجی کـانتـیـزم"، بوو بە بابەتی مـەعـریفـەی زانـسـتـی. ئیـتـر لەو کـاتەوە بۆ یەکـەمین جـار زانسـتـە مـرۆڤـایەتیـیـەکـانی وەک: "مـێـژووناسـی و کـۆمـەڵناسی و دەروونـنـاسـی و دەروونشـیـکاری و زمـانناسی و ئـابووریناسی و.. هـتـد"، هاتنە ئـاراو فـیکر کـەوتە گـرینگیـدان بە مـرۆڤ لـە هـەمـوو ڕوویەکـەوە، وەک بوونەوەرێکی زمانەوانی و ئابووری و بایەلۆجی.

لێـرەوە ئیـتـر مـرۆڤ بووە چەقی گـەردوون نەک غـەیب. بەمـجـۆرە هەڵسوکەوتی مـرۆڤ بـوو بە بابەتێک بۆ چاودێریی زانسـتی. ئەمـە وای کـرد فـەلسـەفـەی هـیـومـانسـتی دروست بێت، کـە بووە هاوشـانـی شـۆڕشی لیبراڵیزمی بۆرژوازی و پێکهاتنی کۆمـەڵگە پیشەسـازییە مۆدێرنەکان. ئەم گۆڕانکارییانە وای کرد مرۆڤی ئەوروپایی لە قۆناغی تیۆلۆجیی مەسیحییەوە پاشـان قۆناغی میـتـافـیزیکیـیـەوە، بگوازێتـەوە و داخڵ بە قـۆنـاغی زانسـتی پۆزەتڤـسـتی ببـێت "وەکـو ئۆگـست کـۆنت باسی دەکـات". لێرەوە قـۆناغی مۆدێرنە دەست پێ دەکات..

بەو پێـیـەی "فـۆکـۆ" لەم مـۆدێرنەیە جـاڕسـە و تەنیا لایەنی نێگەتیـڤـانەی مـۆدێرنە دەبینێت، ئەوا پێـشـبـینیی مـەرگی مـرۆڤی کـرد، واتە پێـشـبـینی کۆتاییهاتنی سـەردەمی زانستە مرۆڤایەتییەکان و فەلسەفەی هیومانستی

بۆرژوازی کرد کە بۆ ماوەی دوو سەدە لە خۆرئاوادا بالادەست بوو. بەڵام "فۆکۆ" لەم مەسەلەیەدا پەلەی کرد و کارێکی سەرەڕۆیانەی کرد. نەیارەکانی ئەم پەرگیرییە نیچەوییەیان بە هەل زانی و دەستیان کرد بە پەلاماردانی "فۆکۆ" و داکۆکیکردن لە فەلسەفەی هیومانستی و دەستکەوتەکانی شارستانییەتی لیبراڵیی خۆرئاوایی. ئەوانەی سەرمەشقی ئەم هەڵمەتەن "لۆک ڤێری و ئالان رینۆ"ن. هەرچەندە ئەوان ناهەقی دەرهەق بە "فۆکۆ" دەکەن، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا بۆچوونەکانیان شایەنی ئەوەیە بە هێند وەربگیرێت، چونکە ئەوان دەیانەوێت داکۆکی لە فەلسەفەی هیومانستی ئەورووپایی بکەن و بەها سەرەکییەکانی بپارێزن کە برێتییە لە "جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤ و هاوولاتی". بە کورتییەکەی "لۆک ڤێری و ئالان ڕینۆ" دەیانەوێت ئیعتیبار بۆ بەهاکانی ژیاری خۆرئاوا بگێڕنەوە، ئەو بەهایانەی لەسەر دەستی فەیلەسووفانی پۆست مۆدێرن ڕووبەڕووی لێک شیتاڵکردن و ڕەخنەی توند بوونەوە.

لێرەدا پرسیارێک دێتە ئارا کە ئایا چۆن دەبێت فەیلەسووفە مەزنەکان، دژی مرۆڤ بن یاخۆ دژی فەلسەفەی مرۆڤگەرا بن؟ بۆ ئەمە پێویستە بگەڕێینەوە ناو سیاقی مێژووی خۆرئاوا، بۆ ئەوەی لە هەلومەرجەکە تێبگەین و بەهەڵەدا نەچین. لە سایەی فەلسەفەی هیومانیزمدا تاوانکاریی گەورە دژ بە مرۆڤایەتی ئەنجام دراوە. هەردوو شەڕی دووەمی جیهانی و شەڕە کۆلۆنیالییەکان، لە سایەی سیستمە دیموکراسییە بۆرژوازییەکاندا ڕوویان داوە! ئەی کەواتە بۆچی فەلسەفەی هیومانستی ڕێگەی لەمانە نەگرت؟ لێرەوە مرۆڤی ئەورووپایی متمانەی بەم فەلسەفە هیومانستییە نەما کە شتێک دەڵێت و بە عەمەلیش شتێکی تر دەکات. هەر بۆیە لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی توند بووەوە.

یەکەمین کەسێکیش کە کەوتە ڕەخنە لێگرتنی "میشێل فۆکۆ" نەبوو، بگرە قوتابخانەی فرانکفۆرت بوو. "لۆک ڤێری و ئالان ڕینۆ" دان بەوەدا دەنێن کە

رەخنەگرانی فەلسەفەی هیومانیزم، لە هەندێک شوێندا رەخنەکانیان بەجێیە، لەبەرئەوەی کاتێک نەوەی "فۆکۆ و دۆلۆز" لە ناوەڕاستی سەدەی ڕابردوودا گەیشتنە زانکۆ، فەلسەفەی هیومانیزم برێکی زۆر لە ڕاستگۆیی خۆی لە دەست دابوو. لەم هەلومەرجەشدا فیکری رەخنەیی "فۆکۆ" و فەیلەسووفانی تری پۆست مۆدێرن هاتە ئارا. کێشەکە لەوەدایە ئەمانە ڕەخنەکانیان هەموو سنوورێکی بەزاند و لەبری ئەوەی هەوڵی چاککردنی داوودەزگاکان بدەن، خەریک بوو بە تەواوەتی وێرانیان بکەن!.. لەبری ئەوەی هەوڵی ڕاستکردنەوەی ئاڕاستەی مۆدێرنە بدەن، هەوڵی ئەوەیان دەدا لە ناوی بەرن، مەترسی گەورەی ئەم ئاقارەش بە بۆچوونی "لۆک ڤێری" لێرەدایە.

بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە لەم مەسەلەیەدا، ئەوەیە "لۆک ڤێری" ڕەخنەی ئەوە لە فەیلەسووفانی پۆست مۆدێرن دەگرێت کە بوونەتە پاشکۆ و پاشبەندی فەلسەفەی ئەڵمانی، کەچی ئەو بۆ خۆشی پشت بە فەیلەسووفێکی گەورەی ئەڵمانیا دەبەستێت بۆ ڕەخنەگرتن لە پۆست مۆدێرنەکان! بۆ ئەم مەبەستە "لۆک ڤێری" دەگەڕێتەوە بۆ لای "هاپرماس" و تیۆریا بەناوبانگەکەی لەبارەی ئەقڵانییەتی کۆمنیکاشیۆنی، لە پێناو ڕەتکردنەوەی تێزە و تیۆرەکانی "میشێل فۆکۆ"دا.

## فۆکۆ و ڕەخنەگرتن لە ئەقڵی خۆرئاوا

سەروەختێک نێو و نێوبانگی "میشێل فۆکۆ" دنیای گرتبووەوە، بەڵام لەم چەند ساڵانەی دواییدا کاریگەری کەم بووەوە.. سەرەڕای ئەوەش بیر و بۆچوونی ئەم پیاوە، تا هەنووکە جێگەی سەرنج و تێڕامانە و لە کایەی زانستە مرۆڤایەتییەکاندا و بەتایبەتی بواری مێژووناسی و دەروونناسی و سیاسەتناسی، مشتومڕی لە بارەوە دەکرێت. لەم کتێبە نوێیەدا کە سەبارەت بە "میشێل فۆکۆ"یە و "دیدییە ئەریبۆن"ی هاوڕێی نووسیویەتی، زانیارییەکی زۆری لەبارەی ئەو فەیلەسووفانە تێدایە کە هاوسەردەمی "فۆکۆ" بوون، یاخۆ مشتومڕی فەلسەفی توندیان لەگەڵیدا هەبووە. نموونەکانیان وەک: "ژان پۆڵ سارتەر، جۆرج دیمۆزیل، لوی ئاڵتۆسێر، یۆرگن هابرماس، لۆک ڤێری وەزیری خوێندنی باڵا لە فرەنسا و.. هتد".

وەکو دەزانرێت "دیدییە ئەریبۆن" ڕۆژنامەنووسێکی بەناوبانگی گۆواری "نۆڤێل ئۆبسێر ڤاتور"ە و لەوێدا بەرپرسیاری بەشی ڕۆشنبیرییە و خاوەنی چەندین کتێبە، لەوانە: "گفتوگۆ لەگەڵ کلۆدلیڤی شتراوس، جۆرج دیمۆ زیل و ژیاننامەی میشیل فۆکۆ". بەمجۆرە دەکرێت بڵێین "دیدییە ئەریبۆن" زیاد لە هەر کەسێکی تر ئاگەداری بارودۆخی ڕۆشنبیریی فرەنسایە. ڕەنگە نەتوانم تەواوی بەشەکانی ئەم کتێبە بەسەر بکەمەوە، بەڵام ئاوڕ لە چەند وێستگەیەکی گرینگ دەدەمەوە، لەوانە پێوەندی "فۆکۆ" بە "یۆرگن هابرماس"ی فەیلەسووفی بەناوبانگی ئەڵمانیاوە. وەکو ئاشکرایە ڕۆشنبیرانی ئەوروپا و ئەمەریکا خوازیاری ئەوە بوون مێزگردێکی فەلسەفی گەورە لە نێوان ئەو دوو مەزنە بیریارەدا بکرێت و تەنانەت هەندێک پێیان

وایە، ئەو شتە بە ناڕاستەوخۆیی روویداوە. ئەو مەسەلەیەی ئەم دوو بیریارە لە سەری ناکۆکن مەسەلەیەکی شەخسی نییە، هێندەی مەسەلەیەکی گشتییە و پێوەندی بە پێگەی ئەقڵ و ئەقڵانییەتەوە هەیە لە کولتووری خۆرئاوادا.

رۆشنبیرانی ئەورووپا "فۆکۆ" دەخەنە بەرەی "نیچە"وە، واتە لە بەرەی نائەقڵانییەکاندا دایدەنێن، "هابرماس"یش لەو بەرەیەدا ئەژمار دەکەن کە دوو سەرسەختترین نەیاری "نیچە"ی تێدایە، واتە "کانت و هیگڵ". ئەم دوو بیریارە بە ترۆپکی ئەقڵانییەتی ئەورووپی دادەنرێن، بەڵام فەیلەسووفانی پۆست مۆدێرن و لەوانەش "میشێل فۆکۆ" دەیانەوێت ئەو ئەقڵانییەتە دەگمەنە لەبەریەک هەڵبوەشێنن. لەم مشتومڕە فەلسەفییەدا، نووسەری ئەم کتێبە بەلای "فۆکۆ"دا دەیشکێنێتەوە و بەرامبەر "هابرماس" و شاڵاوە توند و تیژەکانی بۆ سەر فەیلەسووفانی پۆست مۆدێرنە، بەرگری لە "فۆکۆ" و هاوڕێکانی دەکات.

"هابرماس" پێی وایە فەیلەسووفانی پۆست مۆدێرن دەیانەوێت، مۆدێرنە و رۆشنگەری و دەسکەوتەکانیان تێکوپێک بدەن. ئەوە بوو کاتێک بانگهێشتی پاریس کرا تا لە کۆلێژدی فرانس لێکچەرێک لەبارەی مۆدێرنە پێشکێش بکات، شاڵاوێکی توندی کردە سەر هەندێک لە فەیلەسووفانی فەرەنسایی لە نێو ماڵی خۆیاندا! "هابرماس" دەڵێت: «ئەوانە بە بیانووی تێپەڕاندنی مۆدێرنە دەیانەوێت دەسکەوتە باشەکانیش لەناوبەرن. کە دەشڵێم مۆدێرنە مەبەستم ئەو ئەقڵانییەتەیە کە لە کۆتایی سەدەی هەژدەم، سەدەی رۆشنگەری، لە خۆرئاوادا هاتە ئاراو مەزینی خۆرئاوا نیشان دەدات و بواری ئەوەشی سازدا تا ئەورووپاییەکان بۆری تەواوی میللەتانی دنیا بدەنەوە.. بۆیە دەکرێت بڵێم فەیلەسووفانی فرەنسا، کەسانێکی عەدەمی و نیچەوین و هەست بە بەرپرسیارێتی ناکەن». تەنانەت کار دەگاتە ئەوەشی بە کەسانی ئانارشیزم ناوزەدیان بکات، چونکە ئەوانە دەخوازن رەخنەیەکی

ریشـەیی توند لە ئەقڵانییـەت بگرن تا پایە و دیوارە ئاسنینەکانی لەق بکەن، لەبەرئەوەی ئـەقڵ بۆ ئەوان بووەتە زیندان و گۆڕسـتـانێک. من لای خـۆمـەوە زیاد لـە نووسـینێکمـدا وتـوومـە: «تێگەیشتن لەم مـەسـەلانە، لە دەرەوەی چوارچێوەی کولتووری خۆرئاوا کارێکی ئەستەم و گرانە».

دەبێت رەخنەگرتن لە ئەقڵ بۆ ئەو کۆمـەڵگەیانەی پێویستی زۆریان بە ئەقڵ و ئەقـڵانـیـیـەت هـەیە "وەکـو کـۆمـەڵگەی ئیـسـلامی"، چ مـانایەکی هـەبێت؟ بێگومان هیچ مانایەکی نییە و بگرە زۆر ترسناکیشە. بەڵام مەسەلەیەکی وا بۆ رۆشنبیـری خۆرئاوا کە زیاد لـە دوو سەدەیە ئـەقڵی زانسـتی و فـەلسـەفی بەڕێوەی دەبات، رەوایە و تێگەیشتنیشی ئاساییە. ئـەم ئەقڵـە زانسـتـییـەی خـۆرئـاوا بە هۆی چاوبرسـیـیـەتی و پاوانخـوازی زۆر و زەوەندیەوە لـەگـەڵ تێـپـەڕبوونی کـاتدا، وەرگـۆڕاوە بـۆ "ئەقـڵێکی تەکنۆلۆجی، سـەرمـایەداری، مـاتماتیکی سارد و سڕ". کـەواتە ئەوەی پێویـسـتـە رەخنە بکرێت و لەبەریەک هـەڵـبـوەشـێنرێت خـودی ئەقڵ خـۆی نیـیـە، بگرە شـێـواز و چۆنیـەتی بەکـارهێنانیـەتی. چـونکە مـرۆڤـایەتی ناتوانێت بـێ ئەقڵ یان لە دەرەوەی ئەقڵدا بژی. رەنگە شـاعیـر حـەز بکات بۆ چرکـەسـاتێک لە دەرەوەی زەبر و سـانسـۆرەکانی ئەقڵدا بگوزەرێنێ تا چامـەیەکی شیـعری بنووسێت، بەڵام ئەمە بۆ فەیلەسووف زەحمەتە.

سـەبارەت بەو رەخنانـەی "دێریدا و فـۆکـۆ و لیـوتارد" لـە مـۆدێرنە و ئەقڵانییەتی دەگرن، "هـاپرماس" پێیان دەڵێت: «بەرپرسیاریەتی لە ڕێ لادانی ئەقڵ ناکەوێتـە ئەستۆی نوێگەری کولتووری یان فەلسەفی، بگرە لە ئەسـتۆی نوێگەری کـۆمـەڵایەتی و پاڵـەپەسـتـۆ و زەبر و زۆری ئـابووری و دەوڵـەتی سـەرمـایەداریدایە». ئەو پێی وایە کە دابڕانێک لە نێوان هونەر و ژیان یاخـۆ لە نێـوان فـەلسـەفـە و واقـیـعدا دروست بووە، هـەر لەبەرئـەوەشـە فـەلسـەفـە دووچاری قەیران بووە. لەسـەروەختـی "کانت و هیگڵ"دا، فەلسەفە ئەستێرەی بەختی لە درەوشـاندنەوەدا بوو، بەڵام کـاتێک لەوە کەوت شـانبـەشـانی ژیان

ڕێ بکات و توخنی کێشەکانی واقیع بکەوێت، وشک هەڵات و مرد. بۆیە ئەو ئەرکە فەلسەفییەی لەسەرشانی ڕۆشنبیری ئەوروپاییە لەمڕۆدا، ئەوەیە ئاراستەی نوێگەری کۆمەڵایەتی بەرەو لایەک بەرێت، پێچەوانەی ئەو ئاراستە سەرمایەدارییە پاوانخوازییە بێت کە لە ئارادایە. ئەمەش لەیەک کاتدا ئەرکێکی هەم سیاسی و هەم فەلسەفیشە.

"هابرماس" لەو لێکچەرەیدا سەرکۆنەیەکی زۆری "نیچە" و نیچەوییە هاوچەرخەکان دەکات و پێی وایە ئەوانە بەرەو لەناوچوونمان دەبەن. وەکو چۆن فیکری "نیچە" بە ماوەیەکی کەم پێش دەرکەوتنی "هتلەر" کەوت، ئەوا ڕەنگە فیکری فەیلەسووفانی نەیاری مۆدێرنە "نەک پۆست مۆدێرنە" هەمان بەرەنجامی لێ بکەوێتەوە، چونکە فاشیزم تا هەنووکەش لە ئەوروپادا هەیە و بەیەکجاری نەمردووە. ئەم شتانەی "هابرماس" دەیڵێت بەجێیە، بەڵام پێویستی بە ڕاستکردنەوە هەیە یان پێویستی بەوەیە بخرێتە سیاقی خۆی، بۆ ئەوەی زیاد لە پێویست ناهەقی دەرهەق بە "فۆکۆ و نیچە" نەکەین. خوێنەری بەڕێز دەبێت ئاگای لەوە بێت کە "هابرماس" وەکو هەر ڕۆشنبیرێکی ئەڵمانی، تارمایی "هتلەر" و نازیزمی بەسەر سەرەوەیە. لەبەر ئەوە ناتوانێت بەشێوەیەکی بابەتی باس لە "نیچە و هایدگەر" بکات، بەڵام "فۆکۆ" وەکو ڕۆشنبیرێکی فرەنسایی دەتوانێت ئەوە بکات، لەبەرئەوەی گرێی نازیزمی نییە.. هەرچی "هابرماس"ە پێی وایە نازیزم نێوبانگی گەل و مێژووی ئەڵمانیای لەکەدار کردووە، ئەمەش ئەرکێکی قورسی خستووەتە سەر شانی گەلی ئەڵمانی و نەوەکانی داهاتووی. لەبەر ئەوە ئەو ترسێکی زۆری لە ئاقاری نائەقڵانییەت هەیە، چ لە ڕۆشنبیری ئەڵمانیدا بێت یان ئەوروپایی. هەر لە پای ئەمەشە بە توندی دەرگیری ئەو ئاقاری ئەقڵانییەتەیە کە سەردەمی ڕۆشنگەری بەرجەستەی کردووە، لەسەر دەستی "کانت و هیگڵ" گەیشتە ترۆپک.

کەواتە بەدحاڵیبوون لە نێوان فەیلەسووفی ئەڵمانی "هابرماس" و

فەیلەسووفی فرەنسایی "فۆکۆ"، شتێکی ناچاری بوو.. کەسانی وەکو "فۆکۆ و دێریدا و دۆلۆز" تەنیا بە "نیچە و هایدگەر" سەرسام بوون، دوو کەسێک کە "هابرماس" زۆر بە توندی رەخنەیان لێ دەگرێت.. فەیلەسووفانی فرەنسا بۆیە بە "نیچە و هایدگەر" سەرسام بوون، چونکە لەو ئەقلانییەتە چاوچنۆکەی خۆرئاوا وەڕس بووبوون. ئەوان سەرشێت بوون لەوەی چۆنچۆنی ئەم ئەقلانییەتە بەشدار بوو لەو شالاوە کۆلۆنیالییە خوێناوییەدا!! بۆیە دەبێت "هابرماس" لە رەخنەکردنی ئەمانەدا، کەمێک پشوو درێژتر بێت. چونکە ئەو ئەقلانییەتەی ئەو بەرگری لێ دەکات، بەو رادەیە بێ گوناه و دەست سپی نییە.

"میشیل فۆکۆ" کاتێک کتێبە بەناوبانگەکەی "مێژووی دێوانەیی لە سەردەمی کلاسیک"دا بلاوکردەوە، شەڕی کۆلۆنیالیزمی فرەنسایی لە جەزائیر لە لووتکەدا بوو ١٩٦١، رەنگە ئەمە تەنیا کاری رێکەوت نەبووبێت، لەبەرئەوەی ئەقلی خۆرئاوا گەشتبووە ئاستێک پێویستی بە رەخنە و لێپرسینەوەیەکی توند هەبوو. "فۆکۆ"ش ئەم کارەی کرد کاتێک کەوتە ستایشکردنێکی زۆری دێوانەیی، بەلام دێوانەیی ئاسایی نا، بگرە دێوانەیی بلیمەتە ناودارەکانی وەک: "نیچە، هۆلدەرلین، ئەنتۆنین ئارتۆ، جێرار دی نێرڤال". "فۆکۆ" لە رێی ئەمانەوە دەیویست بلێت: «پێویستە دێوانەیی ئەمان ئەقلی خۆرئاوایی دادگایی بکات، نەک ئەم ئەقلە دێوانەیی ئەوان دادگایی بکات!».

"دیدیە ئەریبۆن" لە کتێبەکەیدا دەلێت: «هاتنی هابرماس بۆ پاریس و کۆلێژدی فرانس، بۆ فۆکۆ قورس و گران بوو، بۆیە بەناچاری و بۆ ماوەی چەند دەقەیەک ئامادەی بەشێکی یەکەمین لێکچەری هابرماس بوو، دوای ئەوە لە دەرگای پشتەوە هۆلەکەی جێ هێشت بۆ ئەو جەماوەرە زۆرەی هاتبوون هابرماس ببینن». "فۆکۆ" چووە ئۆفیسەکەی خۆی کە لە هەمان جێگەدا بوو، چونکە پێشوەخت دەیزانی "هابرماس" چی دەلێت و باسی چی

دەكـــات.. بەڵام هـەر ناچار بوو بـەوەی داوەتی ئێـــوارە خـــوانێكی بكات، بەتایبەت كە ئەو دوای مردنی "ژان پۆڵ سارتەر" بەناوبانگترین فـەیلەسووفی ئەو وەختـەی فـرەنسـا بوو. بۆیە نەدەكرا لە پێشـوازیكردنی بەنێوبـانگـترین فەیلەسووفی هاوچەرخی ئەڵمانیا هەڵبێت.

سـەبارەت بەو ئێـوارە خـوانەی لـە یەكـێك لە چێـشـتـخـانەكـانی "الحي اللاتيني"دا بوو، "پۆل ڤـینی" مـێـژوونووس وەك شـایەتحـاڵێك و یەكـێك لە ئامـادەبووان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: «مـشـتـومـڕی نێوان فۆكۆ و هاپرمـاس بە زمانی ئینگلیزی دەسـتی پێ كرد، مشـتومڕەكەیان بـە ئەتەكێت و سـاردوسڕ بوو. سـەرەتا هـاپرمـاس بە رەخنەكردنی هـەندێك دەستپێشـخـەری فرانسـوا مێتـرانی سـەرۆكی ئەوسـای فـرەنسـا دەسـتی پێ كرد و پاشـان هـاتە سـەر فەلسەفە. پێشبینی دەكرا بـەریەككەوتن ڕوو بدات، لەبەرئەوەی هـەردوولایان گەرم بووبـوون». بەڵام بەر لەوەی بگاتە ئـەوە فـۆكـۆ بە ڕسـتـەیەك كـۆتایی بە قـسـەكـانی هـاپرمـاس هێنا و وتی: «بـەڕێز رەنگە من ئانـارشـیـست بووبم!». وەكو ئاشكرایە "هـاپرمـاس" "فۆكۆ" بـە كەسێكی ئانارشـیـست و عـەدەمی و رەشـبینی وەك "نیچـە" دەداتە قەڵەم. گفـتوگـۆی نێوان ئەو دوو بیریارە بەمـە كۆتایی پێ هـات. پرسـیـارێك لێرەدا دێتـە ئارا ئەوەیە: ئایا ئـەو ئەقـڵانییـەتەی خـۆرئاوا كە لـەمڕۆدا كـۆنتـرۆڵی دنیـای كردووە، پێـویسـتی بە پێداچوونەوە و دەسكاریـكردن هـەیە یان نـا؟ ئایا ئەو ئەقـڵانیـیـەتەی سـەردەمی ڕۆشـنگـەری هێنایە ئاراوە و لـەسـەر دەسـتی "كـانت و هـیگڵ" گـەیشـتـە لووتكە، پێـویسـتی بەوەیە رەخـنەی ریشـەیی لێ بگـیـرێت یـان نـا؟ ئایا پێـویسـتـە ئەقـڵانیـیـەتی مۆدێرنە جێ بهێڵین ڕووەو ئەقڵانییەتی پۆست مۆدێرنە یان نا؟

"هـاپرمـــاس" لای خـۆیـەوە راست و رەوان پێـمـان دەڵێت: «ئەقـڵانـیـیـەتی ڕۆشنگـەری و هـیـچی تر نـا، بەڵام دوای راسـتكـردنەوە و پێـداچوونـەوەیەكی ورد». ئەمـەش ئەوە دەگەیەنێت "هـاپرمـاس" دژی ئەوە نییە رەخنە لە مـۆدێرنە بگـیـرێت، بەڵام دژی ئـەو رەخـنـە وێرانكـەرەیە كـــە بە بیـــانووی ئەو هـەڵە و

سلبیاتانەی ئەم ئەقڵە لە ناوەوە و دەرەوەی ئەوروپادا ئەنجامی داوە، دەسکەوتە ئیجابییەکانیشی وەلاوە دەنێت. بۆ خۆم پێم وایە ئەمە هەڵوێستی دروست و حەکیمانەیە و خێروبێری بۆ گەلانی ئەوروپایی و غەیرە ئەوروپاییش تێدایە. ئەقڵانییەتی خۆرئاوا گەر بێت و دەستبەرداری لووتبەرزی و لە خۆباییبوون بێت و بگەڕێتەوە سەر ئەو دۆخە هیومانستی و ئەخلاقییەی، خەسڵەتی سەرەتاکانی دروستبوونی بوو لە سەر دەستی مەزنە دامەزرێنەرانی وەک "ژان ژاک رۆسۆ و ئیمانوێل کانت"، ئەوا تەواوی مرۆڤایەتی لەو کارە بەهرەمەند دەبن و ڕەنگە لە پای ئەمەش ڕۆژێک بێت ئاشتی و ئارامی و خۆشگوزەرانی، باڵ بەسەر تەواوی میللەتانی سەر گۆی زەویدا بکێشێت!!

با واز لەمە بهێنین و جارێکی تر بێینەوە لای ئەو مشتومڕە توندەی نێوان "کانت و نیچە" یاخۆ نێوان "هابرماس و فۆکۆ". داخۆ دەبێت کەوهەری ئەم مشتومڕ و گفتوگۆیەی نێوان ئەم دوو ئاقارە لە کوێدا بێت؟ تۆ بڵێی ئێمە بتوانین تێی بگەین، یاخۆ ئەمە کارێکە لەسەروو توانای ئەقڵ و ئیدراکی ئێمەوەیە؟ چونکە ئێمە بەشەڕ و کێشەیەکی ترەوە سەرقاڵین کە هیچی لەو شەڕ و کێشەیەی ناو کولتووری خۆرئاوا کەمتر نییە، هێندە نەبێت کە شەڕی ئێمە لانی کەم بە دوو سەدە لە دوای شەڕی ئەوانەوەیە. مەبەستیشم ئەو شەڕەیە هەنووکە لە نێوان ئەقڵی ئسووڵیی تەقلیدی و ئەقڵی مۆدێرندا لە ئارادایە. کەواتە ڕەخنەگرتن لە ئەقڵ و مۆدێرنە و ڕۆشنگەری، چ مانایەکی هەیە بۆ ئەو میللەتانەی تا ئێستاش ئەزموونی حوکمی ئەقڵ و مۆدێرنە و ڕۆشنگەرییان نەکردووە؟ ئایا شەڕێکی فەلسەفی لەم جۆرە کە تەواوی ڕۆشنبیرانی ئەوروپا و ئەمەریکای بەخۆیەوە سەرقاڵ کردووە، بۆ ئێمە خۆخەڵەتاندن و کات بە فیڕۆدان نییە؟ ئایا ئەمە مەترسی بۆ سەر پرۆژەی ڕابوونخوازیمان نابێت، ئەگەر بە خراپ لێی تێگەیشتین وەک زۆرجاران بە خراپ تێی گەیشتووین؟

بۆیه من لای خۆمەوه کاتێک قسه لەم مەسەلەیه دەکەم، تەواو خۆمی بۆ تەیار دەکەم و دەڵێم: «نابێت به هەڵه لەو مەسەلانه حاڵی بین، چونکه هیچ کەس له خۆرئاوادا نایەوێت دەستبەرداری دەسکەوتەکانی مۆدێرنه بێت و لێیان پەشیمان نییه». ئەوانەشی له خۆرئاوا رەخنەی توندیان له مۆدێرنه و ئەقڵانییەت دەگرت، ئێستا کەمێک دەستیان کێشاوەتەوه.. ئەوەتا خودی "میشێل فۆکۆ" دەستبەرداری ئەو رەخنه رادیکالییه بووه که له مۆدێرنەی دەگرت، ئەمەش بەروونی لەو لێکچەرەیدا دیاره که له کۆلێژدی فرانس لەبارەی تێکسته بەناوبانگەکەیەوه "ئیمانوێل کانت" "رۆشنگەری چییه؟" پێشکێشی کرد. بۆ یەکەم جار ئەو لەو وتارەیدا که بەناوی "کانت و شۆڕش"ەوه بوو، روونیکردەوه ئەو دەچێتەوه سەر ئەو هێڵه فیکرییەی خاوەنی "رەخنەی ئەقڵی پەتی" بەر له دووسەد ساڵ له ئێستا سەرەتاکانی دیاری کرد.. ئەم هەنگاوەی "فۆکۆ". "هابرماس"ی خۆشحاڵ کرد و بەخاڵێکی ئیجابی دایه قەڵەم لەسەر گەشەکردنی فیکری "فۆکۆ". هەر لەبەر ئەمەش بوو که کاتێک ئەو (واته فۆکۆ)، له مانگی حوزەیرانی ١٩٨٤ کتوپڕ ماڵئاوایی له ژیان کرد، "هابرماس" به وتارێکی غەمگین و گرینگ لاواندییەوه.

## بوون و زەمەن
## یەکەمین کتێبی مارتن هایدیگەر و دوا وەرگێڕانی
## بۆ سەر زمانی فرەنسی

بوون و زەمەن کتێبێکی فەیلەسووفی ئەڵمانی "مارتن هایدیگەر"ە و ساڵی ١٩٢٧ لە چاپ دراوە. بۆ یەکەمین جار بەر لە دووەم جەنگی جیهانی وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی فرەنسی، ئەمەش دوای ئەوەی "هنری کۆربان" هەستا بە وەرگێڕانی تەواوی دەقە ئەڵمانییەکەی بەو مەبەستەی لە دەزگای گالیمار بڵاوی بکاتەوە، بەڵام شەڕ بەرنامەی کارەکەی وەستان و چەند بەشێکی کتێبەکە نەبێت هیچی تری لێ چاپ نەکرا. لە سەرەتاکانی جەنگی دووەمی جیهانیدا هەڵبژاردەیەکی نوێی بوون و زەمەن بڵاو کرایەوە، ئەمەیان "جۆزیف رۆڤان" وەری گێڕابوو، لە گۆواری "ئەربالات" کە لە شاری لیۆن دەردەچوو دەستی بە بڵاوکردنەوەیان کرد. پاش کۆتاییهاتنی شەڕ ئەرکی وەرگێڕانی کتێبەکە بە "ئەلفۆنس ولهنس"ی مامۆستای زانکۆی "لۆڤان" سپێردراو، ئەمیش بە هاوکاری "ڕۆدۆلف بۆهیم" دەستیان بە کارەکە کرد و پێکەوە ٢٣٠ لاپەڕەیان لە کۆی ٤٣٧ لاپەڕە کە قەوارەی تەواوی کتێبەکەیە، وەرگێڕایە سەر زمانی فرەنسی و لە هاوینی ١٩٦٤دا بڵاو کرایەوە و دوای ئەوەش چەند جارێکی تر چاپ کرایەوە.

لە سەرەتای حەفتاکاندا دەزگای گالیمار هەوڵی دا ئەو بەشەی تری کتێبەکە کە نەکرابوو بە فرەنسی وەربگێڕێت و چاپی بکات، ئەم کارەشی بە "جان بۆڤرێ" سپارد دوای ئەوەی لەسەر چۆنیەتی ڕێکخستنی وەرگێڕانێکی تەواوەتی هەردوو بەشەکەی بە مەبەستی یەکخستنی زمانی وەرگێڕانەکەی

پێکهاتن. ساڵی ۱۹۷۹ وەرگێڕێکی نوێ هاتە ڕیزەوە، ئەم وەرگێڕە نوێیە کە ناوی "فرانسوا فازان" بوو لەسەر داوای "جان بوفرێ " هات و دوای ئەوەی لە سەرەتای ساڵی ۱۹۸۰دا بۆندێکی تایبەت بەو مەسەلەیەی لەگەڵ دەزگای گالیمار مۆر کرد، سەرلەنوێ کەوتەوە وەرگێڕانی کتێبەکە.

دوا وەرگێڕ کە تەواوی کتێبەکەی لە حوزەیرانی ۱۹۸٥دا بۆ سەر زمانی فرەنسایی وەرگێڕا، "ئیمانۆیل مارتینۆ" بوو. "مارتینۆ" پێشەکییەکەی بەم دەستەواژەیە دەست پێ کردبوو: «ئومێدەوارم بەم زووانە گالیمار سەرلەنوێ بە چاپی بگەیەنێت». هەرچی وەرگێڕانەکەی "فرانسوا فازان"یشە، ئەوا هەنووکە لە کتێبخانەکاندایەو بۆ ئەنجامدانی ئەم کارەش "فازان" پێویستی بە شەش دانە ساڵ هەبوو. ئەوەتا لەم بارەیەوە دەڵێت: «وەرگێڕانی بوون و زەمەن نەک دوای شەش ساڵ، بگرە دوای شەست ساڵ لە چاپە ئەڵمانییەکەی و دە ساڵ پاش مردنی هایدیگەر تەواو بوو. ئەمەش مایەی سەرسوڕمان نییە، لەبەرئەوەی کتێبەکەی ئیمانۆیل کانت ڕەخنە لە ئەقڵی پەتی، چاپی ئەڵمانییەکەی ساڵی ۱۷۸۱ بڵاو بووەوە و لە ساڵی ۱۸٤۹دا وەرگێڕدرایە سەر زمانی فرەنسایی».

یەکێک لە خوێنەرەکانی "هایدیگەر" دەڵێت: «وەرگێڕانی نووسینەکانی ئەو بۆ سەر زمانێکی تر کارێکی تاقەت پڕووکێنە، تەنانەت ئەوانەشی ئەڵمانی دەزانن زۆر بە زەحمەت لە زمانی کتێبی بوون و زەمەن تێ دەگەن. زمانی ئەم کتێبە لە زمانی کتێبێکی تریەوە نزیکە بە ناوی ڕێگە بەرەو قسەکردن». قورسیی ئەم کتێبە بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، بە شێوەیەکی زۆر تایبەت نووسراوە و ڕێچکەیەکی نوێی بیرکردنەوەی گرتووەتە بەر کە فەرهەنگی زمانی فەلسەفی پێشتر شتی وای بە خۆیەوە نەبینیوە. واتە دەتوانین بڵێین: «مەسەلەکە پێوەندی بە بەکارهێنانی زمانەوە نییە، هێندەی پێوەندی بە هێنانە ئارای زمانێکی نوێوە هەیە».

ئەمەش مانای ئەوە ناگەیەنێت کە "هایدیگەر" تێرمێکی تازەی بۆ زمان داتاشیوە، بگرە ئەو وەکی هەر نووسەرێکی نوێ لەناو زمان خۆیدا خەریکی داتاشینی زاراوە بووە. سەبارەت بە کتێبەکەی "پەیامێک لەبارەی هیومانیزم"، دەنووسێت و دەڵێت: «ئەگەر هاتوو بۆچوونەکانی بە شێوەیەکی پێویست نەگەیشتن، ئەوا هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بە زمانێکی میتافیزیکیانە نووسراوە. ئەولەویەت بەر لە وشە و بەر لە فۆرمی تەعبیرکردن بۆ دیاردەیە و تەنیا دوای ئەویش نۆرەی چەمکەکان دێت».. ئەوە قسەی "هایدیگەر" خۆیەتی کە لە ساڵی ١٩٢٥دا کردوویەتی.

هەندێک جار تێکەڵێک لە نێوان "بوون و زەمەن"ی "هایدیگەر" و "بوون و نەبوون"ی "جان پۆڵ سارتەر"دا دەکرێت، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە لە کاتێکدا "سارتەر" سەرگەرمی دانانی "بوون و نەبوون" بووە، کەم تا زۆر ئاگای لە "بوون و زەمەن" نەبووە و نەیخوێندووەتەوە. هەندێک بیریار وای بۆ دەچن گەر "سارتەر" بەر لە نووسینی "بوون و نەبوون" لە "بوون و زەمەن"ی "هایدیگەر" ئاگادار بوایە، ئەوا فەلسەفەی هاوچەرخ ئاڕاستەیەکی تری دەگرتە بەر!

لە "سەرەتایەک بۆ میتافیزیک"دا "هایدیگەر" دەڵێت: «بوون و زەمەن – هەر بە تەنیا ناوی کتێبێک نییە، بگرە ئاماژەکردنە بۆ ئەرکێک کە پێویستە پێی هەستین و کاری پێ بکەین. ئەمە دەسپێکی پرسیارکردنە و وەڵامدانەوەشی بەرەو ڕێگەیەکی دوور و درێژی مەعریفەمان دەبات، بەڵام مەعریفەیەکی نادیار و فیکرێک کە بنەچەو سەرەتاکان بە بیر دێنێتەوە». "جان بۆفرێ" کە هاوڕێی "هایدیگەر"ە و یەکێکە لەوانەی پێی سەرسامە و بە وەرگێڕانی کتێبەکانییەوە بۆ سەر زمانی فرەنسایی خەریکە، سەبارەت بە کتێبی "بوون و زەمەن" دەڵێت: «کتێبێکی سەیر و ئەفسووناوییە، لەبەرئەوەی ئەوانەی دەیخوێننەوە نازانن لە کوێدا دەست پێ دەکات و لە کوێدا کۆتایی دێت». هەروەها دەڵێت: «من بۆ خۆم بەردەوام دەمپرسی دەبێت مەبەستی ئەم کتێبە

چی بێت؟». دۆستێکی تری "هایدیگەر" دەڵێت: «کتێبێکی پڕ پێچ و پەنایە».

تەنانەت لە پایزی ١٩٤٦دا کاتێک "جان بۆفریێ " بە سەردان دەچێتە لای "هایدیگەر"، داوای ئەوەی لێ دەکات تا هەندێ ڕوونکردنەوەی لەسەر کتێبی "بوون و زەمەن" بداتێ ، لە وەڵامدا "هایدیگەر" زۆر بە هێمنی و بڕوا بەخۆبوونەوە پێی دەڵێت: «گەر بە ڕاستی ئەمەت بە لاوە گرینگە، ئەوا دەبێت بۆ ماوەی بیست ساڵ خۆتی بۆ تەرخان کەیت، تا بتوانیت لە ناوەڕۆکی ئەو کتێبە بگەیت». "بۆفریێ " دەڵێت: «بۆچوونەکەی هایدیگەرم پەسەند کرد و کەوتمە تاوتوێکردنی بوون و زەمەن، بەڵام ئەمە دوای خۆئامادەکردنێکی تەواو و بەدواداچوونێکی وردی ئاقارەکانی فەلسەفەی هاوچەرخ». سەرەنجام "بۆفریێ " گەیشتە ئەوەی بڵێت: «کتێبی بوون و زەمەن جیهانی فیکری ڕاچڵەکاند».

"هربرت مارکوز" یەکێک لە خوێندکارانی "هایدیگەر" لە کاتی دەرچوونی "بوون و زەمەن"دا، کتێبەکەی بە سەرسڕهێنەر وەسف کرد. "جۆرج میشل"یش وتی: «نووسینی ئەم کتێبە تووشی شۆکی کردین». بەهەرحاڵ "هایدیگەر" دوای دەرچوونی "بوون و زەمەن"، شۆرەت و ناوبانگێکی زۆری پەیدا کرد. ڕەنگە هۆکارەکەشی ئەوە بووبێت کە بە جەسووری و بوێرییەکی کەم وێنەوە، دەستی بۆ مەسەلەگەلێکی وا بردبێت کە بەر لەو جگە لە "هۆسێرل" کەسی تر قەرەی نەکەوتبوو.

لە گەرمەی ئەو سانسۆر و گەمارۆیەی خرابووە سەر بەکارهێنانی چەمکی (کەینوونە) لە قوتابخانە فەلسەفییەکاندا، سەرلەنوێ "هۆسێرل" و دوای ئەویش "هایدیگەر" دەستیان دایەوە زیندووکردنەوەی ئەو چەمکە و بەمەش کەوتنە شکاندنی ئەو ترادسیۆنە فیکرییەی لەو کاتەدا باڵادەست بوو. ئەگەرچی "کەینوونە" چەمکێکی کۆنە لە مێژوودا، بەڵام وەکی "جان بۆفریێ " دەڵێت: «هایدیگەر توانیی بە سەرلەنوێ بەکارهێنانەوەی، مانایەکی ئەوەندە

نوێی پێ ببەخشێت کە لە ڕەگوڕیشەوە بیگۆڕێت». هەر بەپێی قسەکانی "بۆڤرێ" چەمکی "کەینوونە" نابێتە مایەی خستنەڕووی مەسەلەی میتافیزیکا، بگرە مەسەلەیەکی جیاوازتر دێنێتە ئاراوە.

"بوون و زەمەن" کێشەیەکی نوێ باس دەکات، بەڵام لە چوارچێوەی ئەو تێزەدا کە لە کۆنەوە لە ئارادا بووە و بە "کەینوونەوە" سەرقاڵ بووە. واتا کتێبەکەی "هایدیگەر" هەر بە تەنیا وتەزایەک نییە لەبارەی "کەینوونە" و هەوڵی خستنەڕووی بدات، بگرە لە هەمان کاتدا لایەنێکە یاخۆ ڕەهەندێکە لە ڕەهەندە شاراوەکانی فەلسەفە. "کەینون" سەرلەبەر جیاوازە لە "هەبوو"، واتە لە تەواوی ئەو شتانەی لە گەردووندا هەن. لێرەوە چەمکی "کەینوونە" مانا و حەقیقەتی بوون دەگرێتەوە. ئەو ڕووبەرەی دەکەوێتە نێوان "بوون" و "هەبوو"ەوە، ناوەندێکە یۆنانییەکان ناویان لێ ناوە بەبێ ئەوەی بیری لێ بکەنەوە. ئەمەش ئەو نهێنییە کە ڕەسەنایەتی پرسیاری "هایدیگەر"مان بۆ بەیان دەکات.

باشترین ناساندنی فیکری "هایدیگەر"، ئەم دەستەواژەیەی "جان بۆڤرێ"یە کە دەڵێت: «فیکری هایدیگەر نە کورت دەکرێتەوە و نە دەشخرێتەڕوو، فیکری ئەوترووسکاییەکی سەیر و نائاساییە کە لە جیهانی تازەوە سەرچاوە دەگرێت و لە قسەکردندا بەرجەستە دەبێت و سنوورەکانی زمانی باو دەبەزێنێ و پێگەی مرۆڤ لە بووندا دەخاتە مەترسییەوە». کاتێکیش سەبارەت بە ئایندەی فیکر و بیر و بۆچوونەکانی پرسیاری لێ دەکرێت، "هایدیگەر" لە وەڵامدا دەڵێت: «دوای چەندین سەدەی تر لە فیکری من تێ دەگەن».

ئەمە بەسە بۆ ئەوەی بزانین کە بۆچی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا، گرینگییەکی ئەوتۆ بە فیکری ئەو نادرێ و وەکی پێویست جێی بایەخ نییە. هاوکات "هایدیگەر" نەیتوانی قوتابخانەیەکی تایبەت بە خۆی دروست بکات

که تەبەنی بیر و بۆچوونەکانی بکات و بەردەوام کار لەسەر تێزەکانی بکات، هەر بۆیە تا لە ژیاندا بوو کـــاریگەریی سنووردار بوو. هەروەها دوای مردنیشی زمانە تازە پڕ گرێ و گۆڵەکەی و فەلسەفە قورسەکەی، دوو بەربەستی گەورە بوون لەوەی فیکری ئەو بتوانێت پەلوپۆ بهاوێ و تەشەنە بکات و لایەنگر و شوێنکەوتوو بۆ خۆی پەیدا بکات.

### کورتەیەک لەبارەی ژیانی هایدیگەرەوە:

"مارتن هایدیگەر" ساڵی ١٨٨٩ لە ئەڵمانیا هاتووەتە دنیاوە. باوکی خزمەتکاری کڵێسا و دایکی ڕەچەڵەکێکی گوندنشینی هەبوو. بە منداڵی فێری زمانی یۆنانی بووە و ساڵی ١٩٠٧ خوێندنی ئامادەیی لە فرایبۆرگ تەواو کردووە. یەکەمین کتێبی فەلسەفی خوێندبێتیەوە و پرسیاری لەبارەی مانای کەینوونە لا دروست کردبێت، کتێبێک بووە، لەبارەی فیکری "ئەرستۆ"وە. خوێندنی زانکۆی لە کۆلیجی تیۆلۆجیا و دواتر لە کۆلیجی زانست دەست پێ کردووە و لەو ماوەیەدا "باسکال و هیگڵ و شیلینگ و نیچە و دیلتی و هۆسێرل و کیرکیگۆر و دۆستۆیڤسکی و هۆڵدەرلین و ڕێلکەو تراکل"ی خوێندەوە.، بە درێژاییی تەمەنی خوێنەرێکی بەردەوامی تێکستە فەلسەفییەکانی سەردەمی تازە و قۆناغی کلاسیکی یۆنانی بووە.

لە نێوان ساڵانی ١٩٠٩ – ١٩١١دا ئەگەرچی لەسەر خوێندنی تیۆلۆجیا بەردەوام بووە، بەڵام ئاراستەی فەلسەفی زاڵتر دەبوو. ساڵی ١٩١٣ دوکتۆرای لە فەلسەفەدا وەرگرتووە بووەتە مامۆستای یاریدەر لە زانکۆی فرایبۆرگ. لە هەمان زانکۆدا ساڵی ١٩١٦، "هۆسێرل" وەکی مامۆستایەک دەستبەکار بووە. ساڵی ١٩١٧ "ئەلفرید بیتری" کە خوێندکارێکی خۆی بوو لە زانکۆ، دەهێنێت و خێزان دروست دەکات. ساڵی ١٩١٨ بە مەبەستی خزمەتی سەربازی دەچێتە ڕیزی سوپاوە. دوو کوڕی لە "ئەلفرید بیتری" دەبێت، یەکەمیان ساڵی ١٩١٩ و دووەمیان ساڵی ١٩٢٠. بە هاوکاریی

"بیتری" هاوسەری توانی لە تودنوبرگ کووخێک دروست بکات و کاتی حەوانەوە و نووسینی خۆی لەوێدا بەسەربەرێت. ساڵی ۱۹۲٦ لە نووسینی کتێبی "بوون و زەمەن" دەبێتەوە و پێشکێشی دەکات بە "هۆسێرل"ی مامۆستای. ساڵی ۱۹۲۳ دەبێتە مامۆستا لە زانکۆی ماربۆرگ و تا ساڵی ۱۹۲۸ لەسەر ئەو کارەی بەردەوام دەبێت، لەو سەردەمەدا زانکۆی ماربۆرگ گەورەترین مەڵبەندی رۆشنبیریی "کانتیە نوێیەکان" بوو لە ئەوروپادا.

"ئەدمۆند هۆسێرل" چاکەی زۆری بەسەر "هایدیگەر"ەوە هەبوو، چونکە ئەو لە دامەزراندنی لە زانکۆی ماربۆرگدا پشتیوانی کرد و هەروەها یارمەتیشی دا بۆ ئەوەی کتێبی "بوون و زەمەن" لە بڵاوکراوەی "رێبەری فەلسەفە و توێژینەوەی فینومینۆلۆجی"دا بڵاو بکاتەوە کە "هۆسێرل" خۆی سەرپەرشتی دەکرد. بە بڵاوکردنەوەی ئەو کتێبە لەو بڵاوکراوەیەدا، "هایدیگەر" توانی لە دەروازەیەکی پانوپۆڕەوە پێ بخاتە ناو دنیای فەلسەفەوە. ئەم کتێبە بەهرەیەکی ڕادیکاڵی لای "مارتن هایدیگەر"ی لاو بەدەرخست و هەر لەگەڵ دەرچوونی ئەم کتێبەشدا، ئەستێرەی بەختی نیوکانتیزم نوێ بەرەو ئاوابوون چوو. لە بەرامبەریشدا فینۆمینۆلۆجیا شوێنی خۆی دەکردەوە، بەو پێیەی لەو سەردەم و ڕۆژگارەدا ڕەسەنترین ئاقاری فیکری بوو. لە نێوان ساڵانی ۱۹۲۷–۱۹۲۸دا وەک بابەتێک "ڕەخنەی لە ئەقڵی پەتی" لای "ئیمانوێل کانت"ی هەڵبژارد، بۆ ئەوەی لە وەرزی خوێندنی زانکۆدا بە خوێندکارانی بڵێتەوە.

"هایدیگەر" پێی وابوو فەلسەفە بە شێوەیەکی ئاسۆیی بەرەو پێش ناچێت، بگرە بۆ خۆی کارکردنێکی بەردەوامە لەناو ژمارەیەک بابەتی بچووکی هەمەجۆردا و هاوکات ململانێیەکی ئازادانەیە کە ڕەگەزی مرۆڤایەتی لەگەڵ ئەو شەوەزەنگ و تاریکییەی هەموو کات لە زیادبووندایە، ئەنجامی دەدات. هەر دەسکەوتێکی فەلسەفی کە لایەنێکی تاریکی بوون ڕووناک دەکاتەوە، لە هەمان کاتیشدا کەلێنی تاریکییەکی تازەتر دەکاتەوە.

دوای خانەنشینکردنی، "هۆسێرل" پێشنیازی کرد "هایدیگەر" وەکی مامۆستایەک لە زانکۆی فرایبۆرگ شوێنی بگرێتەوە، ئەمەش لە ساڵی ١٩٢٨دا بوو. ساڵی دواتر "هایدیگەر" کتێبی "کانت و کێشەی میتافیزیک"ی بڵاو کردەوە و پێشکێشی کرد بە گیانی "ماکس شیللەر". لەم ماوەیەدا ڕازی نەبوو بەوەی بچێتە بەرلین و لە زانکۆی ئەوێدا وەک مامۆستای فەلسەفە دەستبەکار بێت. ساڵی ١٩٣٣ سەرلەنوێ هەمان داواکاری ڕەت دەکاتەوە. "هایدیگەر" "جەوهەری هەقیقەت" بڵاو دەکاتەوە، ئەمەش بریتییە لە دەقی لێکچەرێک کە ساڵی ١٩٣٠ لە بریمن و دوای ئەوەش بە دوو مانگ لە ماربۆرگ و فرایبۆرگ و ساڵی ١٩٣٢ لە درێسدن پێشکێشی کردبوو. ئەم کتێبەی خستنەڕووی فەلسەفەی فینۆمینۆلۆجی بوو بە شێوەیەکی چڕ و قووڵ، وەک ئەوەی لە کتێبی "بوون و زەمەن"دا هاتبوو. لەو بیست لاپەڕەیەی ئەم لێکچەرەیدا، سنوورە سەرەکییەکانی بیر و بۆچوونی داهاتووی خۆی دیاری دەکات و دەتوانین بڵێین هەر لەوێشدا، "هایدیگەر" پێوەندیی نێوان فیکر لەگەڵ هونەر بە گشتی و شیعر بە تایبەتی دەدۆزێتەوە. لەو ماوەیەدا ژمارەیەک خوێندکاری هەبوو کە دواتر دەبنە بیریاری دیار و ناسراو، وەک: "ج. باتوکا و هربرت مارکۆز".

لە نیسانی ١٩٣٢دا "هایدیگەر" قایل دەبێت بەوەی ببێتە سەرۆکی زانکۆی فرایبۆرگ. ئەمەش هاوکاتی گۆڕانکاری سیاسی بوو لەناو ئەڵمانیادا و حکوومەت بە هۆی بۆچوونەکانی سەبارەت بە مەرکەزییەتی فیکری لە زانکۆدا، پەرۆشی ئەوە بوون پۆستی سەرۆکی زانکۆ بدەن بەو. دواتر "هایدیگەر" ئەمە بە کەمژەترین و ناچێزترین بڕیار دەداتە قەڵەم لە ژیانیدا، هەر بۆیە زوو بەزوو لە پاش ماوەی کەمتر لە ساڵێک دەست لە کارکێشانەوەی خۆی ڕادەگەیەنێت. پاشان ڕوو دەکاتە گرینگیدان بە شیعر و ساڵی ١٩٣٤ لەبارەی "هۆڵدەرلین" دەنووسێت. ساڵی ١٩٣٥ سەرلەنوێ دێتەوە سەر نووسینی "سەرەتایەک بۆ میتافیزیک" و پێی وایە هەر

پرسیارێکی سەرەکی کە ئاراستەی فەلسەفە بکرێت، بە ناچاری دەکەوێتە دەرەوەی ساتەوەختی ئێستاوە.

جارێکی تر و لە فرایبۆرگ لێکچەرێک لەبارەی "سەرچاوەی هونەر" پێشکێش دەکات و دوای ئەوەش لە ڕۆما وانەیەک لەبارەی "هۆڵدەرلین و چییەتیی شیعر" دەڵێتەوە. لە ساڵی ١٩٣٦دا فەلسەفەی "شیلینگ و نیچە"ی بە خوێندکارەکانی دەوتەوە و ئەمەش تا ساڵی ١٩٤٠ بەردەوام بوو. ساڵی ١٩٣٨ لێکچەرێکی سەبارەت بە دیمەنی جیهانی نوێ "وەک ئەوەی میتافیزیک دەیبینێ"، پێشکێش کرد و تێیدا بۆ یەکەم جار هەوڵی هێنانە بەر باسی تەکنۆلۆجیا بەدی دەکرێت. ساڵی ١٩٣٩ بەرنامەی چەند وانەیەکی تایبەتی ڕێکخست و ئەو وانانەشی تایبەت کرد بە "ئەرنست جۆنجەر"، بەڵام نازییەکان ڕێگەیان پێ نەدا بیڵێتەوە. کاتێک جەنگی دووەمی جیهانی کۆتایی هات، وتنەوەی وانەیان لە زانکۆکاندا لێ قەدەغە کرد و لە پای ئەمەشدا "فریتز"ی برای لێرە و لەوێ دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی دەستنووسەکانی، لە ترسی ئەوەی نەبادا بزر ببن یاخۆ بە هۆی بۆمبارانەوە تێدا بچن.

لە ساڵی ١٩٤٥دا بۆ یەکەم جار "جان بۆفرێ و میرلۆپۆنتی و ژان پۆڵ سارتەر"، دەقەکانی خۆیانیان ڕەوانەی لای "هایدیگەر" کرد و ئەمیش نامەیەکی ئاراستەی "سارتەر" کرد، تێیدا داوای لێ دەکات سەردانی تودنوبرگ بکات بە مەبەستی پێکەوە کارکردن و لێکۆڵینەوەی فەلسەفیی هاوبەش. بەڵام "سارتەر" نەیتوانی وەڵامی داواکەی بداتەوە و تەنیا لە نێوان ساڵانی ١٩٥٢-١٩٥٣دا دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخسا تا پێوەندی بە "هایدیگەر"ەوە بکات. ساڵی ١٩٤٧ کتێبی "پەیامێک لەبارەی هیومانیزم" دەنووسێت و ئەم کارەشی پێشکێش بە "جان بۆفرێ " دەکات. دەکرێت ئەم کتێبەی وەها بدرێتە قەڵەم کە ڕوونکردنەوەی ئەو دید و بۆچوونانەیە کە ساڵی ١٩٢٧ لە "بوون و زەمەن"دا باسی لێ کردوون. هەروەها هەندێک

ڕوونکردنەوەی تر لە خــۆ دەگــرێت، بۆ خــۆ جــیــاکــردنــەوە لەو تـەوژمـی بوونگەراییەی ئەوکاتە لە فرەنسا لە برەو و هەڵکشاندا بوو.

بڵاوکردنەوەی "پەیامێک لەبارەی هیومانیزم"، دەبێتە مایەی وروژاندنی مـشـتـومـڕێکی دوور و درێژ لەگـەڵ مـارکـسـیـزمـدا. سـاڵی ۱۹۵۱ وەکی مامۆستایەکی پسپۆڕ گەڕایەوە زانکۆ و تا ساڵی ۱۹۵۷ لەسەر ئەم کارەی بەردەوام بوو. لەم ماوەیەدا بابەتی فیکر "وەک مانای فیکر چییە؟ یاخۆ چی وامان لێ دەکات بیر بکەینەوە؟"، تەوەری سەرەکی باسەکانی دەبێت... لە ساڵی ۱۹۷٦ کۆچی دوایی کرد و سەرمایەیەکی دەوڵەمەندی فیکری و فەلسەفی لە دوای خۆی بۆ بەجێ هێشتین.

## مارتن هایدگەر لە فرەنسا

لەژێر ناونیشانی "مارتن هایدگەر لە فەرەنسا"، توێژەری فەرەنسایی "دۆمینیک جانیکۆ" کتێبێکی قەوارە گەورەی بەدوو بەش سەبارەت بە چۆنیەتی گواستنەوەی فەلسەفەی "هایدگەر" لە ئەڵمانیاوە بۆ فرەنسا بەچاپ گەیاند. "جانیکۆ" مامۆستای فەلسەفەیە لە زانکۆی "نیس" و پرۆژەکەی پرۆژەیەکی گەورە و سەرنجڕاکێشە. ئەمە بۆ یەکەمین جارە، بیریارێک هەڵدەستێت بەتاوتوێکردنی کاریگەری "مارتن هایدگەر" لەسەر کایەی رۆشنبیری فرەنسی. لەبەشی دووەمی ئەم کتێبەدا، نووسەر لانی کەم تەواوی هایدگەرییەکانی فرەنسا دێنێتە قسە، هەرلە"کۆستاس ئەکسلیۆس"ە وە تا "میشل دیگی و ژاک دێریداو ژان بێرفای وەهتد". هەریەکێک لەوانە بەدوور و درێژی باسی پێوەندی خۆی لەگەڵ"هایدگەر"دا دەکات.. چۆنچۆنی ناسیویانە یاخۆ کەی بۆ یەکەم جار تێکستەکانیان خوێندووەتەوە. ئەم گفتوگۆیانە چێژبەخشن و مرۆڤ لە خوێندنەوەیان بێزار نابێت.

لە راستیدا ئەو ئیشکالییەتەی ئەم کتێبە باسی لێ دەکات، گشتییە و"هایدگەر" سەرەرای گرینگیشی تێ دەپەڕێنێ . ئەو پرسیارەی دەکرێت بەمجۆرەیە: چۆن کارلێکی کولتووری لەنێوان دوو ژینگەی جیاواز یان دووزمانی دوور لە یەکی، وەک زمانی ئەڵمانایی و زمانی فرەنساییدا روو دەدات؟ لە پرۆسەی گواستنەوە لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر یاخۆ لە کولتوورێکەوە بۆ یەکێکی تر، چیی روو دەدات؟ ئایا "هایدگەر"ی فرەنسایی هەمان "هایدگەر"ی ئەڵمانییە یاخۆ لە ئەنجامی پرۆسەی گواستنەوە و وەرگێڕاندا، هەندێک گۆڕان بەسەر کارەکتەری خۆی و بیر و بۆچوونیدا

دێت؟ دەکرێت هەمان پرسیار ئاراستەی کایەی ڕۆشنبیریی عەرەبیش بکەین.. ئایا "سارتەر"ی عەرەبی هەمان "سارتەر"ی فرەنساییە، یاخۆ "مارکس"ی عەرەبی خودی "مارکس"ی ئەڵمانییە؟

خوێنەری ئاسایی پێی وایە یەک شتن، بەڵام ئەوانەی پسپۆڕی بواری مێژووی فیکرن، دەزانن کە واقیع وا ناڵێت. بێگومان ئەم بەراوردکردنە زوڵم لە کایەی ڕۆشنبیری فرەنسایی دەکات، لەبەرئەوەی لەبواری وەرگێڕان و گواستنەوەی دەقەکاندا زۆر جدیترە، هەروەها لەبەرئەوەی لە پرۆسەی هەماهەنگیی کولتووری لەگەڵ سەرچاوە بیانییەکاندا، توانایەکی زۆر زیاتری هەیە. ڕۆشنبیری فرەنسایی دەتوانێت بۆ یەک دەق، زیاد لە وەرگێڕانێک بەردەست بخات و تێکستەکانی "هایدگەر"یش زیاد لە جارێک وەرگێڕدراونەتە سەر زمانی فرەنسایی. ئەمەش شتێکە تائێستا کایەی ڕۆشنبیریی عەرەبی دەستی بەسەریدا ناشکێت.

سەرەڕای ئەوە، پرۆفیسۆر "جانیکۆ" دان بە زیان و خراپیی هەندێک لەو وەرگێڕانانەدا دەنێت کە کراون. لەو پێشەکییە گشتییەدا کە بۆ بەشی یەکەمی کتێبەکەی نووسیوە، دەڵێت: «وەرگێڕانی هایدگەر لەلایەن ئێمەوە، ئیتر بەشێوەیەکی باش بێت یان خراپ، مەسەلەیەکی لاوەکی نییە. هەندێک جار وەرگێڕانەکان باش و سەرکەوتوو بوون و هەندێک جاریش خراپ و بێکەڵک بوون! لە ڕاستیدا وەرگێڕان هەموو کات ڕەنگدانەوەی باکگراوەند و نیەتی ئەو کەسانەیە کە پێی هەڵدەستن. وەرگێڕکاران بەباڵیۆزی سەردەمانی کۆن دەچن کە دەیانتوانی شەڕ لە نێوان دوو وڵاتدا دروست بکەن، یاخۆ بەپێچەوانەوە لێکیان نزیک بخەنەوە و پێوەندییان بەهێزتر بکەن».

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە وەرگێڕانی بابەتی بەشێوەیەکی ڕەها بوونی نییە، بەڵام مەحاڵی ئەم شتە ئەوە ناگەیەنێت کە هەموو وەرگێڕانەکان وەکو یەکن. ئاشکرایە وەرگێڕانی چاک وەکی وەرگێڕانی خراپ نییە. بەڵگەش بۆ

ئەمە ئەوەیە کە هەتا ئێستاش خەڵکی بەچاکی باسی یەکەمین وەرگێڕانی "هایدگەر" بۆ سەر زمانی فرەنسایی دەکەن کە خۆرهەڵاتناسی ناسراو "هنری کۆربان"، خاوەنی کتێبی "مێژووی فەلسەفەی ئیسلامی" ئەنجامی دا. "کۆربان" ساڵی ۱۹۳۸ واتە بەر لە جەنگی دووەمی جیهانی، دەقە بەناوبانگەکەی "مارتن هایدگەر" "میتافیزیکا چییە"ی وەرگێڕایە سەر زمانی فرەنسایی. هەرچی کتێبە مەزنەکەشیەتی "بوون و کات"، بەم دواییانە نەبێت بەتەواوەتی وەرنەگێڕدرایە سەر زمانی فرەنسایی.

"بوون و کات" لەلایەن دوو پسپۆڕ لە فەلسەفەی "هایدگەر"دا، دوو تەرجەمە کرا، یەکێکیان لە ساڵی ۱۹۸۵ بڵاو کرایەوە دووەمیشیان ساڵی ۱۹۸٦! لە نێوان ئەو دوو وەرگێڕەدا ململانێیەکی توندوتیژ ڕووی دا، ئەمەش وای کرد ئەو مەسەلە ئەبەدییە بێتە ئارا کە پێوەندی بەهەموو وەرگێڕانێکەوە هەیە، مەسەلەکەش ئەوەیە: ئایا دەبێت دەقاودەق تێکستێک وەرگێڕین، یاخۆ ئەوەی پێویستە گواستنەوەی ناوەڕۆک و ڕۆحی بابەتەکەیە؟ من لەلای خۆمەوە لایەنگری دووەمیانم و ئەوەیانم پێ باشە، بەتایبەت کە بەدرێژایی چارەکە سەدەیەک و تائێستاش خەریکی پرۆسەی وەرگێڕانم.

هەرچۆنێک بێت "هایدگەر" یەکێکە لەوانەی، کێشە و ململانێی فیکری لە کایەی ڕۆشنبیریی فرەنساییدا لەسەر دروست بووە. ئەڵبەتە خۆی دەستی لەو مەسەلەیەدا نەبووە، بگرە ڕۆشنبیرانی فرەنسا لە ناوخۆیاندا بەشەڕهاتن لە سەری، ئەویش بۆ یەکلاییکردنەوەی کێشەکانی نێوانیان. یەکێک لەو شەڕانە لەسەر وەرگێڕانی کتێبی "بوون و کات" بەرپابوو، بەڵام شەڕی گەورەی ئایدۆلۆجی لەسەر کتێبەکەی "ڤیکتۆر ڤاریس" "هایدگەر و نازیزم" ڕووی دا کە لە ساڵی ۱۹۸۷ چاپ کرا. لەگەڵ دەرچوونی ڕۆژنامەکانی فرەنسا شاڵاوێکی بێ ئامانیان دەست پێ کرد، بۆ لێدانی "هایدگەر" و کورتکردنەوەی تەواوی فیکر و فەلسەفەکەی بۆ تەنیا فەلسەفەی نازیزم! ئەم هەڵمەتی پڕوپاگەندەکردن و ناوبانگ زڕاندنە، شتێکی ترسناکە

و بەپرۆسەی کوشتن و پاکتاوکردن دەچێت، بەڵام لە بەرامبەر ئەو شاڵاوە نارەوایەدا، فیکری "هایدگەر" بەسەرکەوتوویی هاتە دەرێ. تائێستاش بەردەوام خەڵک بەرهەمەکانی دەخوێننەوە، لە سەری دەنووسن و دوکتۆرا لەسەر فەلسەفە و مەزنیی ئەو وەردەگرن. ئەمە مانای ئەوەش ناگەیەنێت "هایدگەر" هیچ هەڵەیەکی نەبووە و بێ گوناهە، بەڵام کەس ناتوانێت لە رێی پروپاگەندە و درۆی هەڵبەستراوەوە فیکر و حەقیقەت زیندەبەچاڵ بکات.

ئاشکرایە وێنەی "هایدگەر" لە ئەڵمانیا، زۆر جیاوازە لەو وێنەیەی لە فەرەنسادا هەیەتی. لە ئەڵمانیادا پاش جەنگی دووەمی جیهانی، فیکری ئەو لەگەڵ فیکری "نیچە"دا سانسۆریان لەسەر دانراو بەگومان دەوروەدران، کەس نەیدەتوانی بەشێوەیەکی بابەتی باسیان بکات، لەبەرئەوەی گرێی دەروونی ئەڵمانی واتە گرێی هەستکردن بە گوناه و تاوان-، بواری ئەوەی نەئەدا تا بەهێمنی و سەنگینی تاوتوێی فیکری ئەوان بکرێت. بەڵام پێ دەچێت مەسەلەکان بەرەو ئەوە برۆن گۆڕانیان بەسەردا بێت، بەتایبەت پاش ئەوەی "گێرهارد شرۆیدەر"ی راوێژکاری ئەڵمانیای گەنج و بەهێز، بەتوندی دژی ئەوە وەستایەوە کە نابێت تاقیامەت ئەڵمانەکان بەتاوانی نازیزم سەرکۆنە بکرێن!

بەڵام لە فەرەنسا رۆشنبیران بەدەست ئەو گرفتەوە نا ناڵێنن و ئەو گرێیەیان نییە، لەبەر ئەوە پێشوازییەکی بە شکۆیان لە "هایدگەر" کرد، بەمەش ئەڵمانەکانیان تووشی شۆک کرد. کاتێک "هایدگەر" دوای جەنگی دووەمی جیهانی یان لە ساڵانی پەنجا و شەستەکاندا سەردانی فەرەنسای دەکرد، وەک سەرۆک دەوڵەتێک پێشوازی لێ دەکرا. وەها ستایشیان دەکرد، وەک ئەوەی "ئەفلاتون" یان "ئەرستۆ" بێت.

ئەگەرچی فەیلەسووفێکی وەک "یورگن هابرماس" دان بەوەدا دەنێت کە کتێبی "بوون و کات، ۱۹۲۷"ی "مارتن هایدگەر" گرینگترین کتێبی

فەلسەفییە کە لە دوای کتێبی "فینۆمینۆلۆجیای رۆح، ١٨٠٧"ی "هیگڵ"ەوە دەرچوویێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا "هابرماس" ناتوانێت بەشێوەیەکی بابەتی قسە لە فیکری "هایدگەر" یان "نیچە" بکات، لەبەرئەوەی وەکی ئەوان ئەڵمانییە و گرفتاری گرێی نازیزمە و ناتوانێت یەک وشە بڵێت. لە بەشێکی تری ئەم کتێبەدا "دۆمینیک جانیکۆ" دەڵێت: «بە درێژایی حەفتا ساڵ هایدگەر لە ناوەندی ژیانی رۆشنبیری فرەنسایدا بووە، واتە لە ساڵی ١٩٣٠ تا ساڵی ٢٠٠٠، بەڵام ئامادەبوونی بەشێوەیەکی بەردەوام و وەک یەک نەبووە و چەند قۆناغێک هەیە لە پێشوازیکردن و مامەڵەکردن لەگەڵ فیکری ئەودا. بەگشتی دەتوانین بڵێین دوو قۆناغی سەرەکی هەن: قۆناغی بەر لە تیرۆرکردنی لەلایەن ڤیکتۆر ڤاریاسەوە، ئەویش بەتاوانبارکردنی بەنازیزم و قۆناغی پاش ئەوە».

لە درێژەی قسەکانیدا "جانیکۆ" دەڵێت: «سەرەڕای جیاوازی زۆری نێوان هایدگەر و نیچە، بەڵام ئەوەی کۆیان دەکاتەوە و خاڵی هاوبەشی نێوانیانە ئەوەیە کە هەردووکیان لە فرەنسادا پێشوازییەکی گەرم و تایبەتیان لێ کرا. ئەوان بەجۆرێک ناوەندە رۆشنبیرییەکانی فرەنسا پێشوازی لێ کردن تا گەشتنە ئاستی ئەوەی ببنە دوو فەیلەسووفی فرەنسایی تەواو.. هایدگەر و نیچە بە جۆرێک لەگەڵمان تێکەڵاو بوون، وەک دوو فەیلەسووفی بیانی نەمانەوە و بوون بەیەکێک لە ئێمە. ئەمەش بەفیعلی دیاردەیەکی سەرنجڕاکێشە، بەتایبەت هایدگەر کەسێک بووە ستایشێکی زۆری رۆحی جێرمانی کردووە و فەیلەسووفێکی لووت بەرزبووە. بەڵام نیچە رەخنەی زۆری لە ئەڵمانەکان دەگرت و تەنانەت جنێویشی پێ دەدان، کۆی لەوەش نەدەکردەوە کە فرەنساییەکانی لەوان پێ باشتر بێت. زۆرجار سەرسامیی خۆی بەرۆحی فرەنسی دەربڕیوە و بەرۆح قورسیی ئەڵمانەکانی بەراورد کردووە. ئەمە و سەرەڕای بلیمەتی فەلسەفی و شیعری، وا دەکات رۆشنبیرانی فرەنسایی خۆشیان بوێت و سەرسام بن پێی. بەڵام شتێکی

لەم جۆرە لای هایدگەر نییە و، زۆر جاران لە سەرەوە لە فرەنساییەکانی ڕوانیوە و تەنانەت لە ڕووی فەلسەفییەوە بە ساکار و سووکەڵەی لە قەڵەم داون!».

ئەو پێی وابوو لە دنیادا دووزمان هەن بۆ فەلسەفاندن، ئەوانیش زمانی یۆنانی و زمانی ئەڵمانین. فرەنسییەکان ئەوەیان بەسە و شانازییە بۆیان کە فەیلەسووفانی ئەڵمانیا وەردەگێڕن. ئەم هەڵوێستەی بەسووک سەیرکردنێکی گەورەی فرەنساییەکانە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ئەوان "هایدگەر" دەپەرستن. ئەڵبەتە دواتر فرەنساییەکان وەڵامیان دایەوە و بەبیریان هێنایەوە کە ئەوانیش، خاوەنی فەیلەسووفانی گەورەی وەک: "دیکارت و پاسکاڵ و ژان ژاک ڕۆسۆ"ن، بەڵام "هایدگەر" لەم ڕووەوە نەتەوە پەرستێکی توندڕۆ بوو. دەبێت بڵێین کەم تاکورتێک ئەو لەم ڕووەوە لەسەر هەق بوو، چونکە کەس ناتوانێت نکوڵی لە هەژموونی فەلسەفەی ئەڵمانی بکات بەسەر جیهانی نوێدا، وەک چۆن فەلسەفەی یۆنانی هەژموونی بەسەر جیهانی کۆندا هەبوو. ئەگەر بێتو ناوی "کانت و هیگڵ و نیچە و مارکس و فرۆید" لابەرین، چی لە فەلسەفەی نوێ دەمێنێتەوە؟

خاڵێک هەیە کە نەیهێشتووە "هایدگەر" لەناو جوغزی دەمارگیری جێرمانیدا بمێنێتەوە، ئەویش شیعرە. وەکی دەزانرێت "هایدگەر" لە دووەم قۆناغی ژیانی فیکری خۆیدا، گرینگییەکی زۆری بە گوتەی شیعری دەدا، نەک تەنیا بە گوتەی فەلسەفی لۆجیکی یان ئەقڵانی. شاعیر هاوتای فەیلەسووفە لە گەڕان بەدوای پاکی و بێگەردی و پاشان دۆزینەوەی و گوزارشتکردن لێی بە وشە. کەواتە شاعیر و فەیلەسووف بەدوای هەمان شتدا دەگەڕێن، بەڵام بە دوو ستایلی جیاواز. هەردووکیان ڕۆدەچن لەپێناو سۆراخکردنی جەوهەری بووندا، بەڵام ئەڵبەتە هەموو شاعیرێک ئەوە ناکات و توانای ئەو کارەی نییە. ژمارەیەکی کەمی شاعیرە مەزنەکان توانییان ئەوە بکەن. ئەوانەش بەبۆچوونی "هایدگەر" بریتین لە: "هۆڵدەرلین، جۆرج تراکل،

رینیه ماریا ریلکه، رامبۆ، رینیه شار". دووان لەمانە فرەنسایین. بەمجۆرە هایدگەر" دانی بە بلیمەتی فرەنسابییەکاندا نا، لانی کەم لەبواری شیعردا. سەرەڕای ئەوەش لە کتێبخانەکەیدا، دیوانە شیعری شاعیرانی وەک: جێرار دی نێرڤاڵ و بۆدلێر و مالارمێ و پۆل ڤالێری.." تێدا بووە.

"فلیپ سۆلێرز" یەکێکە لەو بیرمەندە فرەنسابییانەی تەنیا بەناوی هایدگەر" سوێند دەخوات، دوای ئەوەی زۆربەی رۆشنبیرانی فرەنسا لە سەروبەندی ئەو شالاوە تیرۆریستیە نارەوایەی ساڵی ۱۹۸۷ لە دژی دەستی پێ کرد، دەستبەرداری بوون و وازیان لێ هێنا. "سۆلێرز" دەڵێت: «هایدگەر تاکە بیریارێکی هاوچەرخە کە دەتوانێت گفتوگۆ لەگەڵ گەورە شاعیرانی وەک هۆلدەرلین و رامبۆدا بکات. ئەو لە سەردەمێکدا دەیانهێنێتە قسە و دیالۆگیان لەگەڵدا ساز دەکات، کە زەوی لەلایەن عەدەمییەتی تەکنەلۆجییەوە پایەماڵ کراوە. ئاقاری هیومانیزم مرد و لە سەردەمی تەکنەلۆجیا و سەرمایەداری پراگماتیدا بە شت بوو. هیچ نەماوە جگە لە دەنگی شیعریی مەزن، دەنگی رامبۆ و هۆلدەرلین، بۆ ئەوەی بەبیرمان بێننەوە کە پاک و بێگەردی سەرەتا بەتەواوەتی نەمردووە و رۆحیش بەیەکجاری خۆرئاوای جێ نەهێشتووە».

## مارتن هایدگەر و سروودەکانی هۆڵدەرلین

دواجار دەقی فرەنسایی کتێبەکەی "مارتن هایدگەر" لەمەڕ "هۆڵدەرلین"ی شاعیری مەزنی ئەڵمانیا، کەوتە بەردەستی خوێنەران. ئەم کتێبەش چون زۆربەی کتێبەکانی "هایدگەر" بریتییە لە کۆکردنەوەی تێکڕای ئەو لێکچەرانەی لە نێوانی سالانی ١٩٣٥-١٩٣٤ پێشکێش بەخوێندکارەکانی کردووە. خەڵکی فرەنسا تەنیا لە سەرەتای ئەمساڵدا (١٩٨٩) وەک توێژەر و رەخنەگرێکی ئەدەبی ئاشنای "هایدگەر" بوون، کاتێک خانەی (گالیمار) لەڕێی "فرانسوا فیدییە" یەکێک لە پسپۆرە مەزنەکان لە وەرگێڕانی "هایدگەر" بۆ سەر زمانی فرەنسایی، هەستا بە لە چاپدان و بلاوکردنەوەی ئەم کتێبە.

تەواوی کتێبەکە تەرخانە بۆ شیکردنەوەی دوو چامە (یاخۆ دوو سروود) لە چامەکانی "هۆلدەرلین"، ئەوانیش بریتین لە (ئەڵمانیا و رووباری راین). هەردوو وشەکەش بارگاوین بە سیمبولە مێژووییە دێرینەکانی گەلی ئەڵمانی. لە بەشی یەکەمی کتێبەکەدا "هایدگەر" کارامەیی و لێهاتوویی خۆیمان وەک رەخنەگرێکی ئەدەبی و شیکارگەرێکی تێکستە ئەدەبییەکان نیشان دەدات، ئەو جیاوازییەشمان بەرچاو دەخات کە لە نێوان خۆیی و رەخنەگرە ئەدەبییە ئاساییەکاندا هەیە. "هایدگەر" هێندەی گرینگی بە پەیبردن بەنهێنی ناوەڕۆکی شیعری شاعیرێکی وەک "هۆڵدەرلین" دەدات، هێندە خۆی بەدۆزینەوەی مانای حەرفیی وشەکان و بەیتە شیعرییەکانەوە خەریک ناکات.

لە دووەم بەشی کتێبەکەدا "هایدگەر" دەیەوێت تیۆرییە شیعرییەکەی

بەسەر هەردوو چامەکەی "هۆڵدەرلین"دا پراکتیزە بکات، تا لە ڕادەی سەرکەوتوویی پرەنسیپەکانی تیۆری هیرمنۆتیکا دڵنیابێت کە لە بەشی یەکەمی کتێبەکەدا باسی لێ کردووە. ئەمەش بۆ خۆی گرتنە بەری شێوازێکی مەنهەجییە، ئیتر ئەو ئاکامانەمان پێ پەسند بێت یان نا کە"هایدگەر" پێی گەیشتووە. تەنانەت دەبێت هەموو رەخنەگرێکی ئەدەبی کە رێزی خۆی دەگرێت پەیرەوی بکات. پێویستە هەر رەخنەگرێک بەرلەوەی دەست بەپرۆسەی لێکدانەوە شیکاریی و قسە لەسەر کردنی دەقێک بکات، بزانێن لە لێکۆڵینەوە پراکتیکییەکەیدا لە کوێوە دەست پێ دەکات. بەکورتییەکەی پێویستە رەخنەگر پرەنسیپە تیۆرییەکانی و جیهانبینی گشتی خۆیمان بۆ بەرهەمێکی ئەدەبی بۆ ڕوون بکاتەوە، تا بەباشی بەجێ و ڕێی ئەو ئاشنا بین. هەروەها بۆ ئەوەی بزانین بەو پرەنسیپە هێرمینۆتیکییە تیۆریانەوە پابەند بووە، یاخۆ لە کاتی پرۆسەی ئیشپێکردنیدا لایداوە لێیان.

تەنیا لەم ڕێگەیەشەوە توانای رەخنەگران و رادەی شۆڕبوونەوەیان بەناو بەرهەمە ئەدەبییە مەزنەکان یان سەوداکردنی لەگەڵ رووکەشیی ئەو دەقانەدا ئاشکرا دەبێت بۆمان، چونکە دواجار دەق موڵکی خوێنەران و رەخنەگرانە نەک هی نووسەرەکەی بێت. لێرەوە مانای ئەو دەقە "روونتر بڵێین مانا جۆرەوجۆرەکانی" لەلایەن نووسەرەکەیەوە نادرێت بەدەقێک، بەقەد ئەوەی لەلایەن خوێنەران و وەرگرانییەوە دەکرێت بە بەریدا . ئەم قسانەش زیاتر دەقە مەزنەکان دەگرێتەوە، نەک ئەو دەقە سادانەی هەڵگری تاکمانایین و ئاشکرا و راستەوخۆن. تێکستە ئەدەبییە مەزنەکان ئاوسن بەماناو ئامـاژەی جۆرەوجۆر، وەک چۆن گەردوون ئاوس دەبێت بەسەماو ئاماژە و سیمبولی جۆرەوجۆر. شاعیرێکی مەزنی وەک "هۆڵدەرلین" پێویستی بە فەیلەسووفێکی لە ئاستی "هایدگەر" هەیە، بۆ ئەوەی بەقوڵایی ناخیدا شۆڕبێتەوە و لەگەڵیدا دابەزێتە ناو جەرگەی دۆزەخ، لەو سەریشەوە دەست

پڕ له دوڕ و مەرجان و سەر سەلامەت بێتە دەرەوە.

بەبۆچوونی من دەبێت لەم ڕوانگەیەوە ئەم کتێبەی "هایدگەر"، لەبارەی "هۆلدەرلین"ەوە بخوێنینەوە.. ڕەنگە چاکتریش بوایە دوای ئەوە بمانزانیایە گەورە ڕەخنەگرانی ئەڵمانیا چۆنچۆنی ئەم دوو چامەیان لێکداوەتەوە، بۆ ئەوەی بزانین ڕەسەنایەتی "میتۆدی هایدگەریی" لە لێکدانەوە و ڕەخنەدا لە چ ئاستێکدایە. "واتە لە ڕادەی جیاوازی و ڕادەی لێکچوونی مەنهەجییەتی هایدگەر، لەگەڵ میتۆدە ڕەخنەییە گەورە باوەکاندا شارەزا بوونیایە". بەهەرحاڵ پێویستە مێژووی نووسینی ئەم دەقە ڕەخنەییانە بەهێند وەربگیرێت، تا بەو پێگەیانە ئاشنا بین کە "هایدگەر" لێیانەوە دەست پێ دەکات.

ساڵی ١٩٣٤ واتە ماوەیەکی کەم بەر لە دەستپێکردنی جەنگی دووەمی جیهانی و ئان و ساتی هاتنە ئارای تەوژمی نازیزم و هاتنە سەرکاری "ئەدۆلف هیتلەر"، ئەم دەقە ڕەخنەییانە نووسراون. دەبێت لێرەدا وریا بین تا نەکەوینە ناو گێژاوی ئەو لێدوان و شالاوانەی بەدرێژاییی ساڵی ڕابردوو، سەبارەت بە"هایدگەر" زۆر لە ڕۆژنامەنووسان و ڕووناکبیرانی فرەنسا دەیان وتەوە. ئەوان پێوەندی "هایدگەر" و نازیزمیان کردە مەسەلەیەک، بگرە کێشەیەکی دروستکراویان بۆ نایەوەو هۆکارەکانیشی لای هەمووان ئاشکرایە. چونکە ناکرێت فەیلەسووفێکی وەکی "هایدگەر" "ئیتر لەگەڵیدا بین یان نا"، کورت کەینەوە بۆ تەنیا چالاکوانێکی سیاسی یان ئایدۆلۆجیای ئاسایی ناو بزووتنەوەیەکی سیاسی "وەک نازیزم". ئەمە درۆودەلەسەیە و لەبەردەم بچووکترین پرسیاردا خۆی بۆ ڕاناگیرێت.

"هایدگەر" نەتەوە پەرستێکی ئەڵمانی بوو، ئەمە شتێکە گومانی تێدا نییە، بەڵام هەمووان دەزانن ئەو دوای ساڵێک لە وەرگرتنی پۆستی ڕاگری زانکۆ و لە ئەوجی دەسەڵاتداریێتی "هیتلەر"دا دەستی لە کار کێشایەوە. ئەمەش

مانای ئەوەیە کە لەگەڵ دەسەڵاتدارانی ڕێژیمی نازی و ئایدۆلۆجیستەکانیدا ناکۆک بووە. ئەو نەتەوەپەرستێکی ئەڵمانی بوو، بەڵام بەشێوەی تایبەتیی خۆی وەکی فەیلەسووفێک کە ڕۆدەچێتە ناخی دەروونی ئەڵمانی و ناخی مێژووەوە و لە هونەریشدا بۆ ئەوە دەگەڕێت، تاوای لێ بکات ببێتە شایەدێک لەسەر ئامادەگیی کەینوونە. لەم حاڵەدا بیریاری مەزن لە ئایدۆلۆجیستی گچکە جیا دەبێتەوە. "هایدگەر" بیریارێکی مەزنە "جارێکی تریش دووبارەی دەکەمەوە لەگەڵیدا بین یان نا، دەبێت ئەم ڕاستییە بزانین و من بۆ خۆم لە زۆر شتدا لەگەڵیدا نیم". هێرشکردنە سەر"هایدگەر" وەکی بیریارێک، مانای هێرشکردنە سەر خودی فیکر دەگەیەنێت. وێرانکردنی بیریارێکی وەکی ئەو لە ڕێی ئەم شاڵاوە چڕ و وردە کە بەهێرشی کاوبۆییەکان دەچێت، سەرەتایەکی ترسناکە، چونکە ڕەنگە دواتر لە دژی بیرمەندانی تر بەگەڕ بخرێت، گەر بەرژەوەندی ئایدۆلۆجی و سیاسی چەند دەستە و تاقمێک ئەوەیان خواست.

"هایدگەر" ئەڵمانی نەژادە و ئاوێزانی ڕۆحی گەلێکی دێرینی وەکی ئەڵمانیا دەبێت کە خاوەن ژیارێکی تایبەت و کولتوورێکی دەوڵەمەندە. لێرەوە ئاساییە وەکی "هۆڵدەرلین"، ئەو شاعیرەی لە سەردەمی نەهامەتی و کوێرەوەری و مەترسیدا ژیا، چاوەڕوانی هەستانەوەی گەلەکەی بکات. "هۆڵدەرلین" بێهوودە چاوەڕوانی دوا تونێلی دەکرد، بەڵام دواجار بۆ خۆی چووە ناو تونێلێکی تاریکتر و زۆر ئەنگوستەچاوتر. چووە ناو شەوی دێوانەیی و تاریکستانە دەیجوورەکەیەوە، لێشی نەهاتە دەرێ تا دنیای جێ هێشت. ئەو شاعیر و نووسەرانەی خاوەنی ئەزموونێکی ترسناک و بێ وێنەن، "هایدگەر" دەخەنە سەر کەڵکەڵەی لێکۆڵینەوە و ئاوێتەبوونێکی ڕەخنەیی داهێنەرانە.

بەڵام جیاوازیی نێوان "هۆڵدەرلین و هایدگەر" ئەوەیە، "هۆڵدەرلین" ئاوێزانی جێرمانایا "واتە ئەڵمانیای مێژوویی" بوو، خەونێک کە هاتنە دی

مەحاڵە، بەڵام خەونی "هایدگەر" هێندەی نەمابوو بێتە دی و ببێتە هەقیقەت. لە ڕووی کات و مێژووەوە زیاد لە سەد و سی ساڵ ماوەی نێوانیانە، "هۆڵدەرلین ساڵی ١٨٠١ چامە بەناوبانگەکەی- جێرمانیا-ی نووسی و هایدگەر ساڵی ١٩٣٥-١٩٣٤ لەبارەیەوە دەنووسێت". لێرەدا ئەڵمانیا لە ڕوانگەی "هۆڵدەرلین و هایدگەر"ەوە دەوڵەت نییە، بگرە هەقیقەتێکی میتافیزیکاییە لە هەناوی مێژووەوە دێت، تا ڕۆژێک لە ڕۆژان ببێتە واقعێکی بەرچاو. دێت بۆ ئەوەی ئاوێزانی مێژوو بێت و بە داهاتووەوە ئاوس بێت.

پاش ئەوەی خواوەندە کۆنەکان خاکی ئەڵمانییان بەجێ هێشت، هەڵۆ بەرزە فڕەکەی "هۆڵدەرلین" وەکی سەرمەشقێک دێت بۆ ئەوەی ئەو هەرێمە بدۆزێتەوە کە ئاوسە بە داهاتوو، بەسەر ئەڵمانیادا باڵەکانی لە یەک بدات: "ئەو هەموو زەمینە، ئەو وڵاتەش- وڵاتی ئەڵمانیایە". لە جێگەیەکی تردا دەڵێت: «ئەو لە توانایدایە باری بەختەوەریی مەزن لە کۆڵ بگرێت». "هایدگەر" پێی وایە ئەم "بەختەوەرییە قورسە"ی "هۆڵدەرلین" باسی دەکات، جگە لە گەلی ئەڵمانیا هیچ میللەتێکی تر ناتوانێت شانی بداتە بەر، چونکە تەنیا ئاراستەی ئەو کراوە و شاندانە بەریشی تەنیا لە ئەستۆی ئەودایە.. پاشان "هۆڵدەرلین" ئەم دێرە شیعرە جوانە دەڵێت: «نیشتمان پشوو دەدات- نیشتمان لە چاوەڕوانیدا پشوو دەدات»، بەڵام نیشتمان چاوەڕوانی چییە؟ یاخۆ ئەو ڕووداوە چاوەڕوان نەکراوە چییە کە ڕای دەچڵەکێنێ و گۆڕانێک لە ڕەوتی ئاسایی شتەکاندا دروست دەکات؟ نیشتمان چاوەڕوانی چییە و نیشتمان خۆی لە کوێیە؟ "هایدگەر" لە وەڵامدا دەڵێت: «نیشتمان لە چاوەڕوانی دیداری خواکاندایە و خۆی بۆ خۆی گرتنە ئەستۆی ئەو بەرپرسیارێتییە ساز و ئامادە کردووە کە نیشتەجێکردنی مرۆڤە لەسەر ئەو زەوییە- واتە دەستپێکردنی مێژوویەکی نوێیە-».

نەوەی "هۆڵدەرلین"- کە لە هەمان کاتدا نەوەی هیگڵیشە، خەونیان بەژیاندنەوەی ئەڵمانیا و هاتنی ئەو ڕۆژە دەبینی کە نیشتمان دڵشاد بێت و

له‌ بزووتن و جـــووڵه‌دا بێ و بـوونیـــشی بێــتـــه‌ بوونێکی هـه‌قــیـقی و به‌رجـه‌ســتـه‌بوو. به‌ڵام ره‌وتی مـێـژوو پڕیه‌تی له‌ ڕووداوی خـۆش و ناخـۆش، هه‌ندێک جار تراجیدیا و نائومێدی ده‌بنه‌ جه‌وهه‌ر و ناوه‌ڕۆکی جیهان. له‌ چاوه‌ڕوانی هاتنی ئه‌و ڕۆژه‌ به‌ڵێن پێدراوه‌دا، ئه‌وه‌ ته‌نیا شاعیره‌ مه‌زنه‌کانن ده‌توانن ڕووبه‌ڕووی ئه‌و تراجیدیایه‌ ببنه‌وه‌ و گوزارشت له‌ دڵه‌ڕاوکێی جیهان بکه‌ن.

# پۆل ریکۆر

بەرایی:

لە ئێستادا "پۆل ریکۆر" بەپیری فەیلەسووفە هاوچەرخەکانی فەرەنسا دادەنرێت. ئەم پیاوە تەمەنی لە هەشتا و چوار ساڵ بەرەو سەرە و تا ئێستاش چالاکە و لە کایەی فیکری فەرەنسایی و ئەوروپایی و نێو دەوڵەتیدا ئامادەگی هەیە. فەرەنساییەکان پاش ئەوەی بۆ ماوەیەکی زۆر پشتگوێیان خست، بەهۆی خەریکبوونیان بە رێبەرانی بنیاتگەری، وەک: "کلۆد لیڤی شتراوس، میشێل فۆکۆ، ژاک دێریدا.. هتد"، ئێستا سەرلەنوێ گرینگی پێ دەدەن و لەم ماوەی دواییدا چەندین کتێبی خۆی و کتێبگەلێک کە لەسەر ئەو نووسراون بڵاو کراونەتەوە. هەروەها چەندین گفتوگۆی دوور و درێژی لەگەڵدا ساز کراوە و چەند تەوەرێکیشی لە کۆوارە تایبەتەکاندا بۆ تەرخان کراوە.

"پۆل ریکۆر" کێ یە و تایبەتمەندییەکانی چین؟

"پۆل ریکۆر" ساڵی ١٩١٣ لە فەرەنسا هاتووەتە دنیاوە و پاش هاتنە دنیاشی، دایکی کۆچی دوایی کردووە. ساڵی ١٩١٥ و لە جەنگی جیهانی یەکەم دژ بەئەڵمانەکان، باوکیشی کوژراوە و لەوکاتەدا "ریکۆر" تەمەنی تەنیا دوو ساڵان بوو. بەمجۆرە ئەرکی بەخێوکردنی دەکەوێتە ئەستۆی باپیرە و داپیرەی و خوشکە گەورەکەی و پووری. ئەمە وای لێ کرد هەر لە سەرەتاوە هەست بەتەنیایی بکات. ئەگەرچی "ریکۆر" خوێندکارێکی هاروهاج و سەربەگۆبەن بووە لە قۆناغی سەرەتاییدا، بەڵام حەزێکی زۆری لە خوێندنەوە

بووه. لەو قۆناغەدا دەستی کردووە بەخوێندنەوەی نووسینی نووسەرە مەزنەکانی وەک: "رابیلیێ و مۆنتاین و پاسکاڵ". هەروەها کەوتووەتە خوێندنەوەی رۆمانەکانی "فلۆبێر و ستاندال و تۆلستۆی". بەڵام ئەوەی دواتر لە ڕووی فەلسەفییەوە کاریگەری زۆری لەسەر بەجێ هێشتووە "دێستەڤیسکی" بووە. "ریکۆر" لە شوێنێکدا دەڵێت: «رۆمانی تاوان و سزا بیرکردنەوەی فەلسەفیمی لەبارەی خراپەکاری لە جیهاندا یەکلایی کردەوە».

یەکەمین ڕووبەڕووبوونەوەی راستەوخۆی لەگەڵ زوڵم و خراپەکاریدا لە ساڵی ١٩٢٤ - ١٩٢٣ دابوو، ئەو دەمە تەمەنی لە یازدە ساڵێک زیاتر نەبوو. ئەوە لە سەروەختی ئەو سکانداڵە بەناوبانگەدا بوو کە لە ئەمەریکا، لە دوو کرێکاری کۆچبەری ئیتاڵی ڕووی دا و بەتاوانێک تاوانبار کران کە نەیانکردبوو. لەپای ئەوەدا ساڵی ١٩٢٧ بڕیاری لەسێدارەدانیان بۆ دەرچوو. ئەمەش لە پێناو رازیکردنی رای گشتی ئەمەریکیدا بوو کە ئەو کات لە دژی بیانییەکان تاوی سەندبوو. لە راستیدا ئەو دوو کرێکارە بوونە قوربانی ئەو شەپۆلی دژە بیانییەی لە ئارادا بوو، ئەگەرنا هیچ تاوانێکیان نەبوو.

سەبارەت بەم ڕووداوە "پۆل ریکۆر" دەڵێت: «زۆر لەم ڕووداوە تووڕە بووم، ئەم زوڵمە نارەوایە هەستی ئەوەی دامێ کە خراپەکاری لە دنیادا هەیە و هەستم بەگوناه کرد و پێم وابوو ئەوەی ڕووی دا من لێی بەرپرسیارم». وەک دەبینین "ریکۆر" هەر لە سەرەتاوە، چاوی بەڕووداوە تراجیدییەکان هەڵهێناوە. تراجیدیای ژیانی کەسێتی خۆی و تراجیدیای ژیانی گشتیش لە دەوروبەریدا.

لێرەوە بۆی ئاشکرا بوو کە شەڕ و خراپەکاری هەیە و لە سەروو خواست و ئیرادەی ئێمەوەیە. بەکورتییەکەی شەڕ و خراپە کێشەیەکی بابەتییە. لەبەرئەوەش دواتر یەکێک لە کتێبە سەرەکییەکانی خۆی بۆ ئەم مەسەلەیە تەرخان دەکات، بەناوی (هێماگەری شەڕ). کاتێک سەدەی بیستەمیش بەو

هەموو شەڕ و تاوان و دزێوییەوە دەستی پێ کرد، "ریکۆر" زیاتر هەستی بەگرینگیی شەڕ و خراپەکاری کرد لە جیهان و مێژوودا. مێژوو سەرتاپای کامەرانی و دەسکەوتی ئیجابی و پێشکەوتن نییە، بگرە هاوکات تراجیدی و ترسناک و مالوێرانییە و پێویستە هەردوو ڕووەکەی ببینین. بەڵام لێرەدا دەبێت باس لەوەش بکەین کە ئەو شەڕ و خراپەکارییانەی "ریکۆر" لە ژیانی خۆیدا و لە ژیانی گشتیشدا ڕووبەڕووی بووەوە، نەبووە مایەی ئەوەی لە ژیان نائومێد بێت یاخۆ ڕق لە ژیان هەڵگرێت. رەنگە ئەو باوەڕە ئاینییەی کە هەیبوو یارمەتیدەری بووبێت، تا ڕووبەڕووی ئەو نەهامەتییانە بێتەوە و دواجاریش بەسەریاندا زاڵ بێت.

ئەو پێی وابوو خێر و چاکە لە پێش شەڕ و خراپەوەیە و یەزدان بۆ خۆی خێر و چاکەیە و بوونی خراپە و زڵم و زۆریش لە دنیادا، نابێت ڕێگری ئەوەمان لێ بکات تێکەڵ بەدنیا ببین و هەوڵی گۆڕینی شتەکان بەرەو باشتر بدەین. چونکە ئەمە کارێکە دەکرێت، بەپێچەوانەی ئەوەی نهلیزم و ئانارشیست و پووچگەراکان باسی دەکەن. کەواتە نابێت بەبیانووی ئەوەی شەڕ و خراپە هەبووە و هەر دەشمێنێت، دەستەوستان بین لە ئاستیدا، بگرە دەبێت هەوڵی سنووردارکردن و کەمکردنەوەی بدەین لە جیهاندا.

تایبەتمەندیی دیار و بەرچاوی "پۆل ریکۆر" ئالێرەدایە، چونکە ئەو یەکێکە لەو فەیلەسووفە دەگمەنانەی بێ هیچ ترس و شەرمێک باس لە ئیمانداریی خۆی دەکات. وەکی دەزانین ئاقاری پۆزەتفستی یاخۆ بێ بڕوایی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەمەوە، دەسەلاتێکی بالای بەسەر فەیلەسووفانی ئەوروپادا هەبوو. هەر لەبەر ئەمە بوو "سارتەر" تاوانباری دەکرد بەوەی "قەشەیەکە و دەم لە فەلسەفە دەدات"، بەلام ئەم گاڵتە پێکردنە کۆڵی پێ نەدا لەوەی بەردەوام بێت لەسەر ڕێچکەی خۆیی و بەردەوام دووانەی زانست و ئیمان یان فەلسەفە و ئاین پێکەوە کۆ بکاتەوە. مامۆستای یەکەمینیشی لەم بوارەدا "گابرێل مارسێل"ی رابەری بوونخوازیی ئیمانداری فرەنسایی بوو،

ئەمەش پێچەوانەی "ژان پۆڵ سارتەر" بوو کە ڕابەرایەتی ئاقاری بێ باوەڕی لە فەلسەفەی وجوودیدا دەکرد.

ئێمەی ڕۆشنبیرانی عەرەب پێمان وایە، تەواوی فەلسەفەی هاوچەرخی ئەوروپایی بێ باوەڕییە و بگرە پێمان سەیرە کەسێک هەبێت، لەیەک کاتدا فەیلەسووف و ئیمانداریش بێت. پێویستە بڵێم ئەمە وێنەیەکی شێواو و نامێژووییە لەبارەی مۆدێرنەی ئەوروپایی، چونکە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئاقاری ئیمانداری لەوێدا نەمردووە، ئەگەرچی لە سەدەی نۆزدەوە گرینگی کەم بووەتەوە و دابڕانێک لە نێوان زانست و ئایندا دروست بووە. لە ئەوروپادا فەیلەسووفی ئیمانداری گەورە هەیە، لەوانە: "کارل یاسبەرز" کە یەکێکە لە سەرچاوەکانی "ریکۆر" و گابرێل مارسێل و بیرگسۆن و.. هتد". "گابرێل مارسیل" لەماڵەکەیدا سالۆنێکی بۆ فەلسەفە و قسەکردن لە فەلسەفە کردبووەوە و هەموو ڕۆژێکی هەینی ژمارەیەک خوێندکاری فەلسەفەی زانکۆ و هەندێک کەسایەتی بەتەمەن گەورەتر لەوان، ئامادەی دەبوون.

"ژان پۆڵ سارتەر" و"میشێل پۆتۆر"ی نووسەر ئامادەی هەندێک لەو دانیشتنانە دەبوون. کاتێک "پۆل ریکۆر" ئاشنایەتی لەگەڵ "گابرێل مارسێل"دا پەیدا کرد، سەرسام بوو بەکارەکتەر و شێوازی پرسیارکردنی فەلسەفی بەشێوەی "سوکرات". فەلسەفەی زانکۆ لەو سەردەم و زەمانەدا ڕۆچووبووە ناو شتە ئەبستراکت و تیۆریزەی دوور لە واقیع و کێشە عەمەلییە واقیعی و بەرچاوەکانی فەرامۆش کردبوو. هەرچی "گابرێل مارسێل"ە، ئەوا لە دانیشتنەکانیدا ڕێگەی نەدەدا بەمشتومڕکردن لەسەر کێشە ئەبستراکتەکان و بەڵگە هێنانەوە بە"کانت و دیکارت"، بگرە بەئامادەبووانی دەوت: «لە ئەزموونی تایبەتی خۆتانەوە فەلسەفە کاری بکەن، نەک لەوەی لە ناو کتێبەکانەوە وەرتانگرتووە».

پاش ئەوە "ریکۆر" ئاشنایەتی لەگەڵ فەلسەفەی فینۆمینۆلۆجیادا پەیدا

کرد، ئەو فەلسەفەیەی لە چاودێریکردنی خودی شت و دیاردەکان خۆیانەوە دەست پێ دەکات، نەک لە ئەبستراکت و قسەی بەتاڵەوە. لێرەوە فەلسەفەی بوون یان فەلسەفەی بوونخوازی: واتە ئەو فەلسەفەیەی لە کێشە واقیعییەکانی بوون دەدوێت و خۆی بە شتە ئەبستراکت و دوور لە واقیعەکانەوە خەریک ناکات دەستی پێ کرد هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو لە ناوەڕاستی سەدەی رابردوودا، "سارتەر" بەسەر ئەو فەلسەفەیەدا زاڵ بوو کە لە سۆربۆندا باڵادەست بوو. تەنانەت بوونخوازی بوو بەمۆدێک تا ئەو دەمەی مۆدی بنیاتگەری هاتە ئارا و لەسەر تەختی فەلسەفە هێنایە خوارێ.

"پۆل ریکۆر" و "کارل مارکس":

پاش ئاشنابوونی بەفەلسەفەی فینۆمینۆلۆجیا، "ریکۆر" پێوەندی کرد بەئاقاری "کەساندنی مەسیحی- Personalizd" کە "ئیمانوێل مۆنێ" ریبەرایەتی دەکرد، بەڵام تاکە جیاوازییەک کە لە نێوان ئەم و فەیلەسووفە ئیماندارەکانی تردا هەبوو، ئەوە بوو کە "ریکۆر" چەپرەوێکی خوێنگەرم بوو. داخۆ بڵێی ئەمە بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە بەڕەچەڵەک پرۆتستانتی بووە؟ یاخۆ هی ئەوە بووبێت هەستێکی زۆری هەبوو بەبوونی زوڵم و خراپەکاری لە جیهاندا؟ رەنگە پێوەندی بەهەردووکیانەوە هەبێت. سەرەڕای ئەوەش هەر لە سەرەتاوە لەژێر کاریگەریی فیکری "مارکس"دا بوو. "ریکۆر" ئەگەرچی خاوەن بیروباوەڕێکی دینی بوو، بەڵام ئەمە رێگر نەبوو لەوەی بەسەر مارکسیزمدا بکرێتەوە.

ساڵی ١٩٣٨ وتارێکی لەژێر سەردێری "پێویستی مارکس"دا نووسی، تێیدا جیاکارییەک لەنێوان مارکسیزمی دۆگماتیست و مارکسیزمی رەخنەییدا دەکات. یەکەمیان پێی وایە گەشتووەتە چارەسەری کۆتایی و کلیلی تەفسیرکردنی جیهانی لەمستایە، بەڵام دووەمیان دان بەفیکرێکی تری غەیرە مارکسیدا دەنێت و ئیعتراف بەڕەوایەتی بوونی دەکات. "ریکۆر"

پێی وایە مارکسیزمی رەخنەیی سەرلەبەر لە فەلسەفەی ئایدیالیستی رزگارمان دەکات. هاوکات رێ لە بەخواکردنی مرۆڤ دەگرێت و بەسەر دیدگایەکی رێژەگەراییدا دەکرێتەوە کە بەداخەوە "مارکس"، بەهۆی پێداگرتنی زۆری لەسەر هێزی بەرهەمهێنان یاخۆ ژێرخان ئافەرۆزی کردبوو.

لاوازیی "مارکس" لەوەدایە کە جگە لە هۆکارە مادی و ئابوورییەکان، تەواوی هۆکارەکانی تری فەرامۆش کردبوو. بەڵام "ریکۆر" تەنانەت لە رەخنەکردنی ئاین لەلایەن "مارکس"ەوە شتی ئیجابی دەبینێت، چونکە مەسیحییەت لە پرەنسیپە سەرەکی و جەوهەرییەکانی ئینجیل لایدابوو. بەم پێیە رەخنەکانی "مارکس" لە ئاین سەرەرای ئەوەی رەخنەگەلێکی رادیکالیش بوون، بەڵام رەخنەیەکی ئازادیخوازانە بوو.

"مارکس" توانی لە فەلسەفەی رۆحانیی ئایدیالیستی رزگارمان بکات، ئەو فەلسەفەیەی پێی وابوو مرۆڤ لەسەروو هەموو مەرجێکی مادی و ئابوورییەوەیە. ئەمەش بۆچوونێکی ئایدیالیستی ئەبستراکتە و لە بەردەم تاقیکردنەوەدا خۆی بۆ راناگیرێت. رۆحانییەتێکی ئایدیالیستی لەم جۆرە، بەختەوەرییەکی وەهمی دروست کردبوو، بۆ دڵخۆشیدانەوەی ئەو مرۆڤانەی هەژار بوون و هەلومەرجێکی مادیی ناهەمواریان هەبوو تەنانەت هانیان دەدان بۆ ئەوەی بەچارەنووسی خۆیان رازی بن و گلەیی لە بەختی خۆیان نەکەن. بەمجۆرە ئاین بوو بە جۆرێک لە "ئەفیوونی گەلان" وەکی "مارکس" خۆی دەیوت.

"پۆل ریکۆر" ئەگەرچی کەسێکی ئیماندار بوو، بەڵام بۆ ساتێک دوودڵ نەبوو لەوەی بداتە پاڵ ئەم دیدگا رەخنەیی "مارکس" و تەنانەت پێی وابوو، کڵێسای مەسیحی دەستی لە هەڵایسانی شەڕی ناوەخۆی ئیسپانیادا هەیە، بەهەموو خراپی و دزێوییەکانەوە. "ریکۆر" دەیوت: «فێندەمێنتالیزمی

مەسیحی بەردەوام لە بەرەی رێژیمە موحافیزکار و سەرکوتکارەکاندا بووە، بەتایبەتی لە سایەی ئەو رێژیمانەدا کە مەسیحییەت تیایاندا ئاینی رەسمی دەوڵەت بووە». لەلایەکی ترەوە "ریکۆر" دۆگماتیستی "مارکس" دەگێڕێتەوە بۆ دۆگماتیستی "هیگڵ"ی گەورە مامۆستای، چونکە ئەوە "هیگڵ" بوو کە سستمی فەلسەفەی کۆتایی پێ هێناو وتی: "هەرچی واقیعە ئەقڵانییە" و راشیگەیاند کە دەکرێت بگەینە مەعریفەیەکی رەها و یەکجارەکی. بەڵام ئێمە ئەوە دەزانین کە نابێت مەعریفەی مرۆڤ رەها و داخراو بێت، بگرە پێویستە بەردەوام کراوە بێت بۆ کەشفکردن و دۆزینەوەی شتی نوێ . لەبەر ئەمە "ریکۆر" بەناوی "مارکسیزمی رەخنەی"یەوە، داوای دژایەتیکردنی مارکسیزمی دۆگماتیستی دەکرد.

"پۆل ریکۆر" و "ژان پۆل سارتەر" :

لە پاش دووەم جەنگی جیهانی ئەوەی لەکایەی رۆشنبیریی فەرەنسایدا ئەستێرەی بەختی لە درەوشانەوەدا بوو، "ژان پۆل سارتەر" بوو. سەروەختێک لێکچەرە بەناوبانگەکەی "بوونخوازی فەلسەفەیەکی مرۆگەرییە" پێشکێش کرد، هۆڵەکە پڕی بوو لە خەڵک و ئەوانەی بەپێوە وەستابوون ژمارەیان زۆر لەوانە زیاتر بوو کە دانیشتبوون. بەمجۆرە فەلسەفەی بوونگەرایی وەکی فەلسەفەیەکی ئازادیخوازی و شێوازێکی ژیان لەدایک بوو، تەنانەت بووە مۆدەیەکی باو و گازینۆکانی "سان ژێرمان دی برێ" گرتەوە. بوونگەرایی سەرکەوت و کۆنترۆڵی کایەکەی کرد، لەبەرئەوەی خەڵکی چاوەڕێیان دەکرد و لەو کاتەشدا وەلامێک بوو بە خواست و ویستەکانی ئەو قۆناغە.

لە ڕاستیدا بۆچوونی "سارتەر" سەبارەت بەئازادی، لەگەڵ ئەو کەش و هەوا ئازاد و پڕ خۆشییەی لەوکاتەدا لە فەرەنسادا هەبوو "واتە ساتەوەختی رزگاریی فەرەنسا لە دەست ئەڵمانەکان، پاش ماوەیەکی زۆر لە ژێردەستی و

سەرشۆڕی و نەهامەتی"، کۆک و گونجاو بوو. تایبەتمەندیی "سارتەر" لەوەدا بوو کە تێکەڵییەکی لە فەلسەفەی فینۆمینۆلۆجی "هۆسرێل" و فەلسەفەی ئۆنتۆلۆجی "مارتن هایدگەر" پێشکێش کرد و سەرەنجامیش کتێبە بەناوبانگەکەی "بوون و نەبوون"ی لێ هاتە بەرهەم. "سارتەر" خۆی پێی وابوو فەلسەفەی بوونگەرایی دەبێت بە دوو بەشەوە: بوونگەرایی مەسیحی کە نوێنەرەکانی بریتین لە: "گابرێل مارسێل و کارل یاسبەرز"، لەگەڵ بوونگەرایی بێ باوەڕدا کە نوێنەرەکانی بریتین لە "مارتن هایدگەر" و "سارتەر" خۆی و چەند فەیلەسووفێکی تری فرەنسایی.

"سارتەر" لە لێکچەرە بەناوبانگەکەیدا باسی لە "نەبوونی خوا کرد"، ئەمەش "پۆل ریکۆر"ی نیگەران کرد و بووە مایەی ئەوەی لێی نزیک نەبێتەوە. بێ باوەڕیی رادیکالانەی "سارتەر" تووشی شۆکی دەکرد، لەبەرئەوەی "سارتەر" پێی وابوو ئەوە بەڵگە نەویستێکی فەلسەفییە و قسە هەڵناگرێت، بەلام "ریکۆر" پێی وابوو مەسەلەیەکی وا مشتومڕ هەڵدەگرێت و نابێت بەو ئاسایییە و زوو بەزوو یەکلایی بکرێتەوە. هاوکات "ریکۆر" دژ بەو عەدەمییەتەی "ژان پۆل سارتەر" بوو کە دەیوت: «مادامەکی دواجار دەمرین و لەناو دەچین، کەواتە هیچ شتێک مانا نییە. سەرەتا و کۆتایی هەر عەدەمە و ئەمەش تاکە هەقیقەتێکە کە هیچ حەقیقەتێک سەرووی ناکەوێت».

سەرەڕای ئەمانەش "ریکۆر" دژ بەو فەردگەراییەی "سارتەر" بوو کە زیادەڕۆیی تێدا بوو، بەتایبەت لە دەستەواژە بەناوبانگەکەیدا "دۆزەخ ئەوانی ترن" تەعبیری لێ دەکات. ئەمە لە کاتێکدا "ریکۆر" حەزی بەپێوەندی ئینسانی دەکرد و پێی وابوو، ژیان لە رێی پێوەندی بەستن لەگەڵ ئەوانی تردا مانای دەبێت. لەبەر ئەم هۆیانە "پۆل ریکۆر" نەبوو بە سارتەری یاخۆ بە وجوودی، سەرەڕای ئەوەی بە بەهرە و لێهاتوویی "سارتەر" سەرسام بوو کە لە بوارەکانی "شانۆ و رۆمان و رەخنەی ئەدەبی و فەلسەفە و... هتد"، شوێن دەستی دیار بوو. سەرەکیترین پرسیارێک لەو کاتەدا "پۆل ریکۆر" بە

بەردەوامی لە خۆیی دەکرد ئەوە بوو، چۆن بتوانین دیالۆگێک لە نێوان فەلسەفەی بوونگەرایی و ئیمانی مەسیحیدا دروست بکەین؟

بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە، "ریکۆر" دەستی کرد بەدروستکردنی جیاکارییەکی سەرەکی لە نێوان ئیمان و ئایندا. بەلام خەلکی بەردەوام ئەم دوو چەمکە تێکەل بەیەک دەکەن، ئەم تێکەلکردنەش هۆکاری ئەو کێشە و بەدحالیبوونە مێژووییەیە کە لە نێوان فەلسەفە و ئیماندا هەیە. بە بۆچوونی "ریکۆر" ئیمان ئاین نییە، یاخۆ دەتوانین بلێین ئیمان لە ئاینێکی دیاریکراودا کورت ناکرێتەوە، بگرە دەچێتە ناو هەموو ئاینەکانەوە و بەجێیشیان دێلێت. هاوکات زۆرجار پیاوانی ئاینی بەناوی ئاینەوە کەوتوونەتە سەرکوتکردنی ئیمان و فیکر! لەم بارەیەوە "پۆل ریکۆر" دەلێت: «سەرجەمی مێژووی فەلسەفە برێتییە لە، بەگژداچوونەوەی ئەو داوودەزگا ئسوولییانەی زانایان و فەیلەسووفان تەکفیر دەکەن و تەنانەت هەندێک جار کار دەگاتە سەر کوشتن و سووتاندنیشیان». بۆ سەلماندنی ئەم قسانەش نموونە بەوە دەهێنێتەوە کە "گالیلۆ و سپینۆزا و سێرڤێ" چییان بەسەر هات.

یەکەمیان کاتۆلیکەکان تاوانباریان کرد و دووەم یەهوودییەکان تەکفیریان کرد و حاشایان لێ کرد، سێیەمیشیان پرۆتستانتەکان سووتاندیان.. ئەوەی فیکری فەلسەفی دژایەتی دەکات، ئەم مەیلە سەرکوتکارییەیە کە لای فێندەمێنتالیستە یەهوودی و مەسیحییەکان هەیە. ناکرێت لە تەواوی مێژووی فیکر بگەین، ئەگەر ئەم مەسەلەیە لە بەرچاو نەگرین. لەبەرئەوەی کۆی ئەو مێژووە برێتییە لە ململانێی نێوان فیکری فەلسەفی و فیکری ئاینی دۆگماتیستی. بەلام ئەگەری ئەوەش هەیە فەلسەفەش وەرگۆڕێت بۆ سیستمێکی کلۆمدراو و دۆگما، ئەگەر خولیای رەخنەگرتنمان نەما و بەوەلامە ئامادە و حازر بەدەستەکان رازی بووین. لێرەوە پێویستە تیۆلۆجیا و فەلسەفە پێکەوە لە چنگی ئەو مەیلە دۆگماییە دەربهێنین کە مرۆڤ

بەخۆڕسک حەزی پێیەتی، ئەوکات دەتوانین دیالۆگێک لە نێوان فەلسەفە و ئایندا دروست بکەین.

## "پۆل ریکۆر" و بنیاتگەری:

لە سەرەتای ساڵی ١٩٦٣ و تەنانەت پێشتریش، بوونگەرایی "سارتەر" دەستی بەپاشەکشە کرد و بنیاتگەری جێگەی گرتەوە. بەمجۆرە بنیاتگەری هەژموونی خۆی بەسەر تەواوی بوارە مەعریفییەکاندا، واتە بەسەر فەلسەفە و زانستە مرۆڤایەتییەکاندا سەپاند. با بزانین هەڵوێستی "ریکۆر" لەم فەلسەفە نوێیە چی بووە؟

ئەڵبەتە "ریکۆر" لەوانەیە کە حەزی بەململانێ نییە و ئەوەی بەچاکتری دەزانێت، بیرکردنەوەیە بەشێوەیەکی هێمن و کۆنکرێتی و خۆپاراستن لە هاشوهووشی دروشمبازی و ئەو مۆدانەی ناو بەناو شاری پاریس دەگرێتەوە. چونکە ئەو شتانەی مۆدن دێن و دەڕۆن، بەڵام فیکر دەمێنێتەوە. بەمجۆرە دەبینین پاش پۆزەتیڤیزم فینۆمینۆلۆجیا دێت و دوای فینۆمینۆلۆجیا بوونگەرایی و پاشان مارکسیزم و بنیاتگەری و.. هتد. ئێستاش پێ دەنێتە قۆناغێکی تازەترەوە، قۆناغی پۆست- بنیاتگەری. چەند ساڵێک بەر لە ئێستا کێ لەو باوەڕەدا بوو کە بنیاتگەری پاشەکشە بکات و رەونەقی نەمێنێت؟ ئێمەی خوێندکارانی عەرەب کە لەو قۆناغەدا چووینە فرەنسا، پێمان وابوو بنیاتگەری راستییەکی حاشا هەڵنەگرە و مشتومڕ هەڵناگرێت. پێمان وابوو بنیاتگەری ئەو کلیلە ئەفسووناوییەیە کە بەیەکجار تەواوی کێشەکان چارەسەر دەکات. بەڵام لە پڕێکدا و بەچاوی خۆمان مەرگ و کەنارکەوتنی بنیاتگەریمان بینی. دەبێت لەسەر وەختی باڵادەستی و رەواجی زۆری بنیاتگەریدا، "پۆل ریکۆر" چ هەڵوێستێکی هەبووبێت؟

"ریکۆر" گرینگیی زۆری پێدا و لەو دەسکەوتە ئیجابییانەش ئاگادار بوو کە بنیاتگەری لەگەڵ خۆیدا هێنابووی. بەڵام وەکی ئەوانەی شوێن مۆد و

دیارده تازەکان دەکەون، نەکەوتە ژێر کاریگەری بنیاتگەری و ستایشکردنی. لە سەرەتای شەستەکاندا بنیاتگەری ڕۆڵێکی گەورەی گێڕا، لە ڕزگارکردنی زانستە مرۆڤایەتییەکان لە دەست ئەو ئاقارە کۆنسێرڤاتیفەی لە سۆربۆندا لە ئارادا بوو. بەهاتنی بنیاتگەری زۆرێک لە توێژەران دەستبەرداری فەلسەفە بوون و کەوتنە لێکۆڵینەوەی یەکێک لە زانستە مرۆڤایەتییەکانی وەک: کۆمەڵناسی و ڕەگەزناسی و دەروونشیکاری و مێژوو.. هتد. ئەمە وای کرد "سارتەر" ڕەونەقی جارانی نەمێنێ و فەیلەسووفێکی تازە پێگەیشتووی وەک "میشێل فۆکۆ"، جێگەی بگرێتەوە. دەبێت هەڵوێستی "ڕیکۆر" لەمە چی بووبێت؟

ئەو گۆڕانانە نەکەوتە پەسندکردن یان ڕەتکردنەوەی بنیاتگەری، بگرە وەکی فەیلەسووفێک کەوتە مشتومڕکردن لەگەڵیدا، بۆ ئەوەی فەلسەفەکەی بەمیتۆد و زاراوەی تازە دەوڵەمەندتر بکات. ئەمە وای کرد "ڕیکۆر" دوای مردنی بنیاتگەریش زیندوو بێت و لەگەڵ ئەودا سەر نەنێتەوە، وەکی لە فەیلەسووفەکانی تر ڕووی دا. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو گرینگیدانەیە بە "ڕیکۆر" لە ساتەوەختی ئێستادا. سەبارەت بەبنیاتگەری، "ڕیکۆر" دەڵێت: «زانستە مرۆڤایەتییەکان لە سەردەمی بنیاتگەریدا قەڵەمبازی مەعریفی گەورەی دا و نابێت فەیلەسووف لە ئاست ئەو گۆڕانانەدا بێدەنگ بێت. فەلسەفەی خودگەرایی یاخۆ بوونخوازی کە لە پێشکەوتن و بەرەو پێشچوونی زانست دابڕابێت، بەرەو نەمان دەچێت یاخۆ دەبێت بەشیعر و ئەدەب. هاوکات فەلسەفەی بابەتگەرایی یاخۆ بنیاتگەری گەر لە بوون و کێشەکانی دوور کەوێتەوە، دواجار دەبێتە چەند هاوکێشەیەکی ماتماتیکیی وشک و برنگ». ئەوە بوو سەرەنجام بنیاتگەری فۆرمالیستی چارەنووسی بەمە گەیشت.

پێویستە لە نێوان پرسیاری ژیان و پرسیاری فیکردا، هەڵوێستێکی مامناوەند وەرگرین و بەلایەکیاندا داینەشکێنین. فەلسەفە بەو دیالۆگە دەژی کە لە نێوان پرسیاری زیندەگی و پرسیاری فیکردا هەیە و

بەجیابوونەوەشیان کۆتایی دێت. بەڵام بنیاتگەرە سەرسەختەکانی وەک: "لوی ئالتۆسێر و کلۆد لیڤی شتراوس و ڕۆلان بارت و ژاک لاکان و میشێل فۆکۆ و پییر بۆردیۆ"، لەم چارەسەرە مامناوەندییە ڕازی نەبوون کە "ریکۆر" دەیخواست. هەر لەبەر ئەوەش هەوڵی کەنار گیرکردنیان دا و لەوەشدا سەرکەوتوو بوون.

لەو کاتەدا "ریکۆر" هەڵهات بەرەو ئەمەریکا، تا لە زانکۆکانی ئەوێدا خەریکی وانەوتنەوە بێت و ماوەی بیست ساڵێک لەوێدا مایەوە، واتە تا ئەو کاتەی بنیاتگەری پاشەکشەی کرد و ئەو کاریگەرییەی جارانی نەما. بنیاتگەراکان تاوانباریان دەکرد بەوەی، کەسێکی ڕۆحانییە نەک زانستی و کەسی واش بە کەڵکی ئەم سەردەمە پێشکەوتووەی بنیاتگەری نایەت! "ریکۆر" بەرلەوەی بەرەو وڵاتە یەککگرتوەکانی ئەمەریکا بەرێ بکەوێت، دەرفەتی ئەوەی بۆ ڕەخسا تا بکەوێتە جەنگێکی فیکری لەگەڵ "کلۆد لیڤی شتراوس"ی ڕابەری بنیاتگەری فەرەنسایی و بگرە جیهانیش. ئەم مشتومڕەش لەسەر لاپەڕەکانی گۆواری "ESPRIT" دەستی پێ کرد. ئەمە مشتومڕێکی فیکریی بەناوبانگ بوو لە شەستەکاندا.

ئەگەرچی لەو سەردەم و زەمانەدا زەمینە بۆ بنیاتگەراکان لەبارتر بوو، بەڵام "ریکۆر" لەو ڕووبەڕوو بوونەوەدا شکستی نەهێنا. بابزانین ناوەڕۆکی ئەو دیالۆگە چی بووە و تەوەرە فیکرییە سەرەکییەکانی کامانە بوون؟

سەرەکیترین خاڵی ناکۆکی نێوانیان، لەسەر ئەو تێڕوانینە سارد و سڕەی میتۆدی بنیاتگەری بوو. "کلۆد لیڤی شتراوس" لافی ئەوەی لێ دەدا کە بەشێوەیەکی بابەتی تاوتوێی شتەکان دەکات و ناهێڵێت مەسەلە زاتییەکانی خۆی تێکەڵ بە کارەکانی ببن. کاری "شتراوس" لێکدانەوە و شرۆڤەکردنی چیرۆک و ئەفسانەی میللەتە سەرەتاییەکانە، وەک چۆن زانایەکی ڕووەک زانی باس لە گوڵێک دەکات. "شتراوس" کاتێک لە ئەفسانەکان دەکۆڵێتەوە

تەنیا بەدوای ئەوەدا دەگەڕێت، بزانێت چۆنچۆنی لە ڕەگەزە سەرەتاییەکانی دروست بووە و مانای بەلاوە گرینگ نییە، لەبەرئەوەی مانا شتێکی هیولامی و نامادییە و ناچێتە ژێر باری لێکۆڵینەوەی زانستی.

لە وەلامی ئەم بۆچوونەدا، "ریکۆر" دەڵێت: «من لە مەبەستی تێ دەگەم و دان بەوەشدا دەنێم کە بنیاتگەری میتۆدێکی بەپێزە بۆ لێکۆڵینەوەی فۆرمالیستی لە ئەفسانە و چامەی شیعری و بنیاتی کۆمەلایەتی و.. هتد، بەلام لەوە تێ ناگەم بۆچی دەیەوێت مەسەلەی مانا لە لێکۆڵینەوەکانی بکاتە دەرێ. ئایا دەق برێتی نییە لە فۆرم و ناوەڕۆک؟ کەواتە بۆچی دەیەوێت لە فۆرم یاخۆ لە بنیاتی پێکهاتەی دەق تێ بگەین، بەلام قەرەی ناوەڕۆک و ماناکەی نەکەوین؟». لە بەرامبەردا "کلۆد لیڤی شتراوس"، "ریکۆر"ی بەوە تاوانبار کرد کە فەیلەسووفێکی خودگەرایە نەک فەیلەسووفێکی زانستی، "ریکۆر"یش بەوە وەلامی دایەوە کە ئەویش فەیلەسووفێکی ساردوسڕە و لە زانستیبوونیدا زیادەڕۆیی دەکات. لە ڕاستیدا "شتراوس" دەیەوێت وەکی مارو مێروو یان وەک شتەکانی تری ناو سروشت، لە مرۆڤ بکۆڵێتەوە و هیچ جۆرە حسابێک بۆ خەسڵەتە رۆحی و مەعنەوییەکانی یان بۆ دەسکەوت و بەرهەمەکانی ناکات. ئەمەش خاڵی ناکۆکی سەرەکیی نێوان رابەری بنیاتگەری و "پۆل ریکۆر"ە.

گەر زیاتریش بڵێین: "شتراوس" کەسێکە ئێجگار رەشبینە بەرامبەر بەمرۆڤ و سروشت و لەمەشدا بە "میشێل فۆکۆ" دەچێت کە لە کۆتایی کتێبە بەناوبانگەکەیدا "وشەکان و شتەکان"، "مەرگی مرۆڤی" راگەیاند. "شتراوس" زیاد لە جارێک باسی لەوە کردووە ئەوەی ئەو دەیەوێت پێکەوەنانی مرۆڤ نییە، بگرە لێک شیتاڵکردن و لەناوبردنییەتی! عەدەمییەتی "شتراوس و فۆکۆ و.. هتد"، لێرەدایە. چونکە ئەوان هیچ بڕوا و متمانەیەکیان بەمرۆڤ نەماوە، پاش ئەو هەموو شەڕ و کارەساتانەی لە ناوەخۆ و دەرەوەی کیشوەری ئەوروپادا روویان دا.

لەبەر ئەوە "شتراوس" و "فۆکۆ" تاوانبار کران بەوەی ڕێبەرانی ئاقاری ئەنتی- هیومانیزم دەکەن، لە فەلسەفەی هاوچەرخی فرەنساییدا. پاش ئەو هەموو کارەسات و ماڵوێرانییەی لە سەدەی بیستەمدا ڕووی دا، متمانەکردن بەمرۆڤی خۆرئاوایی مەحاڵە و ئەوان ناتوانن متمانە بەمرۆڤ بکەن. پاش ئەوەی مرۆڤی ئەوروپایی چووە قۆناغی شارستانیبوونەوە، پێشبینی دەکرا بەربەرییەت و شەڕانگێزی کۆتایی بێت، بەڵام هەر بەچاوچنۆکی و خۆپەرستی و پاوانخوازی خۆیەوە مایەوە. چاکترین بەڵگەش ئەو تاوانانەی کۆلۆنالیست بوو کە لە جەزائیر و ڤێتنام و... هتد، ڕوویان دا. ئیتر چۆن دەکرێت متمانە بەمرۆڤی ئەوروپایی و شارستانییەتەکەیی و ڕاگەیاندنەکانی بکەین، لەبارەی مرۆڤایەتی و مافی مرۆڤ و پێشکەوتن، پاش هەموو ئەوانەی کە ڕوویان دا؟ ئەمە ئەو پرسیارە بوو "میشێل فۆکۆ" لە فەلسەفەی خۆرئاوای کرد. بەڵام "فۆکۆ" ئەوەندە ڕەخنەی لەو شارستانییەت و نوێگەرییەی خۆرئاوا گرت، هێندەی نەمابوو رایان بماڵێت و دووچاری ڕەشبینییەکی وەها ببێت کە بەحەتمی بەرەو عەدەمییەت دەچێت.

لە وەڵامی ئەوانەدا، "ریکۆر" بە "فۆکۆ" دەڵێت: «من دان بەڕەوایەتی تەواوی ئەو ڕەخنانەدا دەنێم، بەڵام سەرەڕای هەموو ئەوانە دەمەوێت دەستبەرداری بڕوابوون بەمرۆڤ نەبم و سەرەڕای هەموو شتێ ، پێویستە متمانە بەمانا و هەقیقەت و مرۆڤ بکەین، گەرنا ئەوا هەڵدەخلیسکێینە ناو دەهلیزەکانی عەدەمییەت و ڕەشبینییەوە کە هیچ ئاکامێکی نابێت». لەم سەرو بەندەدا دەبینین "یۆرگن هابرماس"ی فەیلەسووفی ئەڵمانی، هەمان هەڵوێستی "پۆل ریکۆر"ی هەیە لە فەیلەسووفانی بنیاتگەری و بەوە تاوانباریان دەکات کە دەیانەوێت مۆدێرنە لەناوبەرن. تائێستاش ئەم مشتومڕ و کێشمە کێشە، لە نێوان فەیلەسووفانی ئەوروپا و ئەمەریکادا بەردەوامە و درێژەی هەیە. ئەمە شەڕی مۆدێرنە و پۆست مۆدێرنە، ئەقڵانییەت و نائەقڵانییەت، بڕوابوون بەمرۆڤ و نائومێد بوونە لە مرۆڤ.

## گۆڕانەکانی فەلسەفە

## ئەفلاتۆن، دیکارت، کانت، نیچە

کێن ئەوانەی گرینگترین فەیلەسووفن لە مێژوودا؟ مەسەلەکە هەرچۆنێک بێت، ئەوا وەڵامی ئەم پرسیارە بەپێی حەزو ئارەزووی کارەکتەری توێژەرە هاوچەرخەکان دەگۆڕێت. لەوانە دەکرێت باس لە بیریاری فەرەنسایی "پیر فۆجیرو لاس" بکەین. "فۆجیرو لاس" مامۆستای فەلسەفە بوو لە زانکۆی سۆربۆن و هەنووکەش خانەنشین کراوە. ئەم پیاوە نێوبانگێکی گەورەی لە وانەوتنەوەی فەلسەفەدا هەیەو لە نزیکەوە ئاشنایە بەفەلسەفە. ئەو تەمەنی خۆی لە وتنەوە و قووڵبوونەوە بە ناخی فەلسەفەدا بەخەرج داوەو لە دوا کتێبیشدا دەبینین گرینگی بە چوار ناوی سەرەکی دەدات، ئەوانیش برێتین لە: "ئەفلاتۆن، دیکارت، کانت، نیتشە". لەگەڵ ئەمانەدا گەورە فەیلەسووفانی تریش لە یاد ناکات، ساتەوەختی سەرەکی و چارەنووسساز ئەوانە دیاری دەکەن.

ئەوەتا لە شوێنێکی کتێبەکەیدا دەنووسێت: «بێگومان ئەرستۆ فرە گرینگە و زیاد لە ئەفلاتۆنیش کاریگەری لەسەر فەلسەفەی ئیسلامی و فەلسەفەی سەدەکانی ناوەڕاست هەبووە و وەکی یەکەمین مامۆستای مرۆڤایەتیش دراوەتە قەڵەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دامەزرێنەری فەلسەفە ئەو نییە، بگرە ئەفلاتۆنی مامۆستایەتی». ئەوە "ئەفلاتۆن"ە لە سەدەی پێنجەمی پێش زایندا "واتە ٢٥٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا"، فەلسەفە وەکی پسپۆڕییەکی فیکری و ئەکادیمی دادەمەزرێنێت. بەر لەو فەلسەفە تێکەڵ بوو بە ئاین و شیعر و ئەفسانە، بەڵام "ئەفلاتۆن" هاتوو فەلسەفەی گۆڕی بە میتۆدێکی ئەقڵانیی تەواو.

فەلسەفە لە ساتەوەختی هاتنە ئارایەوە لەسەر دەستی "ئەفلاتۆن" کەقسەکەری یەکەم بوو بەناوی "سوکرات"ەوە "ئەو پیاوەی تاکە حەرفێکی نەنووسی"، هێدی هێدی لە ڕێی پشتبەستن بە بیرکردنەوەی ئەقلانی، خۆی لە بیروباوەڕە دینییەکان و ئەفسانە جیا کردەوە و ئەم خۆجیاکردنەوەش بووە مایەی ئەوەی فەلسەفە بەمانا ئەقلانییەکەی دروست بێت. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە "ئەفلاتۆن" دامەزرێنەری فەلسەفەیە، بەلام ئەمە مانای ئەوە نییە حساب بۆ گرینگیی "ئەرستۆ" نەکەین کە راستەوخۆ دوای "ئەفلاتۆن" هات.

لە ڕاستیدا "ئەرستۆ" کە دەکرێت لە یەک کاتدا وەکی قوتابی و نەیاری "ئەفلاتۆن" سەیری بکەین، نوێنەری ئاقاری ریالیستییە لە فەلسەفەدا. ئەو هات و شێوازێکی نوێی بۆ تێگەیشتن لەو پێوەندییانە هێنایە ئارا کە لە نێوان فەلسەفە و زانست و بوارەکانی تردا هەیە. هاوکات زیاد لە "ئەفلاتۆن" گرینگی بەدیاردە بەرچاو و واقیعییەکان دەدا. "ئەفلاتۆن" یەکێک بوو لەوانەی گرینگیی بەجیهانی ئایدیاکان دەدا، نەک بەجیهانی واقیعی. هەر لەبەر ئەمەش بوو کە رۆحانی و عاریفەکان لە ئیسلام و مەسیحییەتدا، "ئەفلاتۆن" یان لە "ئەرستۆ" خۆشتر دەویست. لێرەوە دەتوانین لەو جیاوازییە تێبگەین کە لە نێوان "ئیبن سینا" ی ئەفلاتۆنی و "ئیبن روشد" ی ئەرستۆ تالیسیدا هەیە. پاش ئەوەی فەلسەفەی یۆنانی بۆ ماوەی هەزار سال کۆنترۆلی فیکری ئینسانی کرد، "دیکارت" هات و کۆتایی بە قۆناغێک هێناو سەرەتایەکی تازەی دەست پێ کرد. ئەمە مانای وایە "دیکارت" چرکەساتێکی نوێیە لە مێژووی فەلسەفەدا.

ئەو کاتێک دروشمە بەناوبانگەکەی راگەیاند: "من بیر دەکەمەوە، کەواتە من هەم"، سەرەتای فەلسەفەی خودگەرایی یاخۆ فەلسەفەی هۆشیاری فەردی لە مێژووی فیکری خۆرئاوادا چێ دەکرد. "دیکارت" بەم کارەی میتافیزیکای ئەرستۆ تالیسی تێکشکاندو لە جێگەیدا میتافیزیکایەکی نوێی

هێنایە ئارا کە پەیوەست بوو بە زانستی مۆدێرن و دۆزینەوە تازەکانی، ئەو دۆزینەوانەی سیمای جیهانی گۆڕی "یان دەتوانین بڵێین دیدو بۆچوونی ئێمەی سەبارەت بە جیهان گۆڕی، بەتایبەت دوای کۆپەر نیکۆس و گالیلۆ و کیبلەر". کەواتە "دیکارت" بە بۆچوونی "فۆجیرۆ لاس"، گەورە چاکسازی فەلسەفەیە. پێم وایە چەمکی "چاکساز" لێرەدا، زۆر لاوازە و نەگونجاوە بۆ کەسێک کە کۆتایی بەقۆناغێکی هەزار ساڵەی مێژووی فەلسەفە هێنابێت. بەڵام پێ دەچێت نووسەر بەو مەبەستە ناوی "چاکسازی" لە "دیکارت" نابێت، تا تێرمی "شۆڕشی فەلسەفی" بداتە "کانت" کە سەدەیەک دوای "دیکارت" هات.

"فۆجێرۆ لاس" پێی وایە فەلسەفە داوی "کانت"، جیاوازە لە ساتەوەختی پێش هاتنی "کانت" و چرکەساتی ئەو دابڕانی گەورەیە لە مێژووی فەلسەفەدا. بەم پێیە دابڕانی گەورە لە مێژووی فەلسەفەی خۆرئاوادا، لەو کاتەدا دەست پێ دەکات کە "کانت" میتافیزیکای بەمانا "ئەرستۆ تالیسی و دیکارتییەکەی" رەت کردەوە و فەلسەفەی لەسەر رێسای زانستی فیزیایی و گەردوونی نوێ داڕشت کە"نیوتن" کەشفی کردبوو. لێرەدا هەوڵ دەدەین کەم تاکورتێک باس لەم مەسەلەیە بکەین. "کانت" پێی وابوو مەعریفەی زانستی بەرهەمی نێوان هەستەکان و چەمکەکانە. هەستەکان یاخۆ ئەزموونە واقیعییە هەست پێکراوەکان، دەتوانن بمانگەیەننە ئەو یاسا زانستییانەی ئاراستەی سروشت و گەردوون دەکەن. هەرچی چەمک و زاراوەکانیشە، ئەوا بەشێوەیەکی لۆجیکی فۆرمەلەی ئەو یاسایانە دەکەن. کەواتە فەلسەفە بەبێ زانستی ئەزموونگەری وەک شتێکی ئەبستراکت و بەتاڵ دەمێنێتەوە و بایەخێکی ئەوتۆی نییە. هاوکات زانستی ئەزموونگەری بەبێ دنیابینییەکی فەلسەفی، کوێر و نابینا دەبێت. لەبەر ئەوە وتمان مەعریفەی زانستی بەرهەمی هاریکاریی نێوان زانستی ئەزموونگەری و تیۆریزەی فەلسەفییە.

بەڵام میتافیزیک بەرهەمی ئەزموونی هەستەکی و چەمکە ئەقڵانییەکان

نییە، بەرەنجامی هاوکاریی نێوانیشیان نییە، بەڵکو ئاکامی ئەقڵی پەتییە واتە ئەقڵی میتافیزیکییە. ئەمەش ئەقڵێکە خۆی بەمشتومڕە سوفیستائییەکانەوە خەریک دەکات کە کۆتایی بۆ نییە. هەندێک لە میتافیزیکاییەکان باس لە نەمریی ڕۆح دەکەن "بۆ نموونە دوای مردن" و هەندێکی کەش پێچەوانەی ئەوە دەڵێن. هەندێکی کەیان دەڵێن جیهان کۆن و سەرمەدییە، هەندێکی تر دەڵێن نوێیە و دروست کراوە. ئەم مەسەلانەش وەکی "کانت" دەڵێت: «یەکلایی ناکرێتەوەو هەر بۆچوونەش پاساوی خۆی هەیە». لەبەر ئەوە شۆڕشی کانتیزم هات بۆئەوەی ئاستێک بۆ ئەم پرسیارە میتافیزیکییە نەزۆکانە دابنێت. "کانت" پێمان دەڵێت: «پێویستە گرینگیی بەوە بدەین کە بەسوودە و بەردەستە و لەم سەروبەندەشدا دوو پرسیاری سەرەکی وروژاند: دەشێت چی بزانین؟ دەبێت چی بکەین بۆ ئەوەی حاڵی مرۆڤی پێ چاک بکەین یاخۆ کێشەکانی پێ چارەسەر بکەین؟».

"کانت" دوای ئەوەی لە ڕێی کتێبە بەناوبانگەکەیەوە "رەخنەی ئەقڵی پەتی" کۆتایی بە میتافیزیک هێنا، فەلسەفە بووە بەتیۆریای مەعریفە و تیۆریایەک لەبارەی ئاکار. لە کتێبی "رەخنەی ئەقڵی تیۆری"دا "کانت" باس لەوە دەکات کە دەبێت چۆن لە ژیاندا هەڵسوکەوت بکەین و بە چ مۆراڵێکیشەوە پابەند بین. "پییر فۆجیرۆ لاس" پێی وایە شۆڕشی فەلسەفیی "کانت"، هیچی لە شۆڕشی سیاسیی فرەنسایی کەمتر نییە کە هاوزەمانی یەکتری بوون. وەک چۆن یەکەمیان فیکری ڕژێمی کۆنی ڕامالی، ئەوا دووەمیان سیاسەتی سەردەمی کۆنی لە کار خست و لە ڕووی عەمەلی و لەسەر ئاستی داوودەزگایی لەناوی برد، بەم جۆرەش مۆدێرنەی ئەوروپایی لەسەر ئاستی تیۆری و عەمەلی دروست بوو.

لێرە بەدواوە دێینە سەر "نیچە"، ئەم پیاوە چی کرد بۆ ئەوەی ببێتە ساتەوەختی چوارەم و سەرەکی لە مێژووی فەلسەفەدا؟ پرۆفیسۆر "پییر فۆجیرۆلاس" پێی وایە "نیچە" یەکەمین کەس بوو کە بە بلیمەتیی خۆی،

حاڵی بوو لەوەی ئەو سەرکێشییە فەلسەفییە مەزنەی "ئەفلاتۆن" سەرەتاکانی دارشت و "دیکارت" چاکسازی تێدا کرد و "کانت" شۆڕشی تێدا بەرپا کرد، گەیشتووەتە کۆتایی خۆی و بەنبەست گەیشتووە. بۆیە پێویستە فەلسەفە بەمانا کلاسیکییەکەی دابخەین، بۆ ئەوەی لاپەڕەیەکی نوێ لە مێژووی فیکری مرۆڤایەتیدا بکەینەوە.

ئەم ئازایەتییە کەم وێنەیە جگە لە "نیچە" کەسی تر نەیبوو. لە کتێبی "گورانی تراجیدیا"دا "نیچە" گەڕایەوە بۆ قۆناغی پێش "سوکرات و ئەفلاتۆن و ئەرستۆ"، قۆناغێک کە شیعر و فیکر لێکتر جیا نەبووبوونەوە و ئەفسانەش ئاوێزانی مەعریفە بوو. لێرەوە بەبڕوای ئەو کاتێک "ئەفلاتۆن" شاعیرانی لە کۆمارەکەی کردە دەرێ و فەلسەفەی لەسەر بنەمایەکی ئەقڵانی لۆجیکی دامەزراند، فەلسەفەی هەژار و بەتاڵ کرد و سەرچاوەیەکی گرینگی لێ بڕی. ئێستا و پاش ئەوەی ئەقڵانییەتی فەلسەفی بوو بە بەستەڵەک و لەسەر دەستی "هیگڵ" گەیشتە لووتکە، پێویستە دوو هەزار و پێنجسەد ساڵ لە مێژووی فەلسەفە بەجێ بێڵین. کاتی ئەوە هاتووە فیکرێکی نوێ بێتە ئارا کە توانای ئاشتکردنەوەی فیکر و شیعر، فەلسەفە و ئاین، ئەقڵ و دەروونی هەبێت.. چونکە مرۆڤ وەکی فەلسەفەی ئەرستۆتالیسی یان دیکارتی یان کانتی پێیان دەوتین، هەر تەنیا ئەقڵ نییە یان وەکی رۆمانسی و عاریفەکان باسیان دەکرد تەنیا دڵ و دەروون نییە، بگرە تێکەڵییەکە لە هەردووکیان. پێویستە هیچ یەکێکیان لەپێناو ئەوی تریاندا فەرامۆش نەکەین.

بێگومان بۆ خوێنەری ئێمە تێگەیشتن لە پەرچەکرداری "نیچە" لە بەرامبەر ئەقڵانییەتی خۆرئاوادا ئاسان نییە، لەبەرئەوەی ئەو تائێستا لە ئەقڵانییەت تێر نەبووە و بەهەقیقیش ئەزموونی نەکردووە. ئەمەش بەپێچەوانەی خوێنەری ئەوروپاییەوە کە چەندین سەدەیە لە سایەیدا دەژی و لێی تێر بووە. لەبەر ئەوە پێویستە مەسەلەکان لە سیاقی مێژوویی خۆیاندا سەیر بکەین، تا بەدحاڵیبوونێکی وا ڕوو نەدات کە زیان لە بەرژەوەندی

رۆشنبیریمان و داهاتوومان بدات. کولتووری ئێمە کە لە ساتەوەختی شکستهێنانی "ئیبن روشد" بەرامبەر "غەزالی" و فەقیە و عارف و دەروێشەکاندا لە فیکری فەلسەفی دابڕاوە، ئەوپەڕی پێویستی بە ئەقلانییەتی فەلسەفی و زانستی هەیە. هەر بۆیە من دوودڵم لە وەرگێڕانی فیکری "نیچە" بۆ سەر زمانی عەرەبی، بەر لە وەرگێڕانی کۆی مێژووی ئەقلانییەتی فەلسەفی، هەر لە "دیکارت"ەوە تا "کانت و هیگڵ".

لە ڕاستیدا ناتوانین لە "نیچە" تێ بگەین، گەر لە "دیکارت و کانت و هیگڵ" نەگەیشتبین، لەبەرئەوەی "نیچە" وەکی پەرچەکردارێک لە دژی ئەوان هاتە ئارا. لەبەر هەمان هۆ مەترسی لە وەرگێڕانی قوتابییە هاوچەرخەکانیدا هەیە، وەکی: "دێریدا و دۆلۆز و فۆکۆ و.. هتد". هەموو شتێک دەبێت بخرێتە سیاقی خۆیەوە، تا بەڕاستی لێی تێ بگەین. ڕەنگە هۆکاری ئەوەی زیاد لە سەدەیەکە شکستمان لە تێگەیشتنی فەلسەفەی خۆرئاوادا هێناوە، بگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئێمە لە کاتی وەرگێڕانیاندا لە سیاقی مێژوویی خۆیان دەریان دەهێنین و لەو سەرزەمینەیان دەقرتێنین کە بەرهەمی هێناون.

لێکشیتاڵکردنی ئەقلانییەتی فەلسەفی هیچ مەترسییەکی بۆ سەر کولتووری ئەورووپایی نییە، چونکە ئەقلانییەت لەو کولتوور و کۆمەڵگەیانەدا بۆ چەند سەدەیەک دەبێت ڕەگی داکوتیوە و شوێن پێی خۆی قایم کردووە، بەڵام بۆ رۆشنبیریی ئێمە نەک هەر مەترسیدارە، بگرە تاوانێکە دەرهەق بە کولتووری ئیسلامی. ئەو کولتوورەی پێویستییەکی زۆری بەوە هەیە، ئەقلانییەتی فەلسەفی و زانستی تێدا بچێنرێت.

## بینیامین باربێر

## جیهاد لە بەرامبەر مەکجیهاندا

لە ئێستادا "بینیامین باربێر" بە یەکێک لە ڕۆشنبیرە دیارەکانی وڵاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا دەژمێردرێت. لە ڕووی گرینگی و نێوبانگیشەوە هیچی لە "فرانسیس فۆکۆیاما و ساموئیل هنتنگتۆن و نەوام چۆمسکی" کەمتر نییە.. ڕەنگە وەکو ئەوان نێو و نێوبانگی لە ناو ئێمەدا نەبیسترابێت، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە لە ڕووی گرینگییەوە لەوان کەمترە."باربێر" لە بەرەی دژ بە "هنتنگتۆن"دایە. لە کاتێکدا "هنتنگتۆن" تەنیا ڕەخنە لە فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی دەگرێت، ئەو دێت و لەگەڵ ڕەخنەکردنی فێندەمێنتالیزمی ئیسلامیدا ڕەخنەش ئاڕاستەی ئیمپریالیزمی بازرگانی و پاوانخوازیی ئەمەریکا دەکات.

"باربێر" پێی وایە تەنیا یەکێک لەو دوولایەنە گوناهبار نییە، بگرە هەردوولایان گوناهبارن و هەریەکەیان هەڵەی خۆی هەیە.. شارستانییەتی خۆرئاوا وەکو "فۆکۆیاما و هنتنگتۆن" باسی لێ دەکەن، بێ کەموکوڕی نییە و ئەو هەراو پشێوییە زۆرەشی جیهانی تەنیوە، بە تەنیا بەرهەمی تەقینەوەی دەمارگیریی ئاینی و مەزهەبی و ئەتنییەکان نییە، بگرە لە هەمان کاتدا بەرهەمی پەلهاویشتن و پاوانخوازیی بەجیهانیبوونی سەرمایەداریی چاوچنۆکە کە جگە لە قازانج و بەرخۆری مادی و بوژاندنەوەی بازاڕی بازرگانی، هیچی تر نازانێت و دەرباسی هیچ نییە.

"بینیامین باربێر" پرۆفیسۆری زانستی سیاسییە لە زانکۆی نیویۆرک و یەکێکە لەو ڕۆشنبیرانەی نزیکە لە "بیل کلینتۆن"ی سەرۆکی پێشووی

ئەمەریکا. هەروەها سەر بە باڵە ڕۆشنگەرەکەی ڕۆشنبیرانی ئەمەریکایە، نەک سەر بە باڵی ڕاستڕەوی موحافیزکار بێت کە "هنتنگتۆن" یەکێکە لەوان، یاخۆ لە ڕیزی لیبراڵییە ڕاستڕەوەکاندا بێت وەکو "فرانسیس فۆکۆ یاما". شایەنی باسە ئەو وەختەی دوو فڕۆکەکە خۆیان کێشا بە سەنتەری بازرگانی جیهاندا، "باربێر" وانەی بە خوێندکارەکانی دەوتەوە لە زانکۆی نیویۆرک و لەودیو پەنجەرەی هۆڵەکەوە بە زیندوویەتی دیمەنی ڕووداوەکەی بە چاوی خۆی بینی.

ئەم ڕووداوە لێکدانەوە و بۆچوونەکانی ئەویان سەلماند، سەبارەت بەوەی کێشە و ململانێیەکی یۆنیڤێرسالی هەیە لە نێوان هێزی جیهاد و کولتووری خۆرئاواییدا. مەبەستی "باربێر" لە جیهاد کۆی ئەو گرووپ و ڕێکخراوانەیە کە دژایەتی مۆدێرنە دەکەن، ئەڵبەتە فێندەمێنتالیزمی ئیسلامیش لە ڕیزی پێشەوەی ئەوانەدایە کە بەم کارە هەڵدەستن. بەڵام نەک تەنیا ئەوان، بەڵکو بە بڕوای ئەو فێندەمێنتالیزمی جوولەکە و مەسیحی و هندۆسی و.. هتد، دژایەتی مۆدێرنە و فەلسەفەی ڕۆشنگەری دەکەن.

ئەگەر کێشە و ململانێیەک لە نێوان فێندەمێنتالیزمی جیهادی و بەجیهانیبوونی سەرمایەداریدا "بەشێوە ئەمەریکاییەکەی" هەبێت، ئەوا دەکرێت بڵێین لە نێوان هەردوولایاندا تێکەڵاوبوون و پێکداچوونیش هەیە. ئەمەش بۆ خۆی مایەی سەرسڕمانە.. ئێمە وامان دەزانی فێندەمێنتالیزمی ئەرسۆدەکسی لە بەرەیەکە و بەجیهانیبوونی سەرمایەداریش لە بەرەیەکی ترە، بەڵام واقیع وا ناڵێت. بۆ نموونە ئەوانەی پەلاماری نیویۆرک و واشنتۆنیان دا، سەلماندیان لە تەحەکومکردن بە ئامرازەکانی تەکنۆلۆجیا چەند لێهاتوو و شارەزان. ئەوانە دەتوانن ئەنتەرنێت و ئامرازەکانی زانیاری تازە و فڕۆکە تیژڕەوەکان و مۆبایل و.. هتد، بە باشترین شێوە بەکاربهێنن. دەرکەوت ئەوانە منداڵێکی گەمژە و هیچ نەزان نین، بەڵکو خەڵکانێکن لێهاتووییەکی زۆر و زیرەکییەکی لە ڕادە بەدەریان هەیە. هەر بۆیە دەزانن

چۆنچۆنی ئامێر و ئامرازەکانی سیستمی سەرمایەداریی خۆرئاوا بەکاربهێنن، لە پێناو تێکوپێکدان و وێرانکردنی ئەو سیستمەدا.

لێرەوە "باربێر" دەگاتە ئەوەی بڵێت: «فێندەمێنتالیستەکان بە ئەقڵ سەر بە جیهانی مۆدێرنن، بەڵام بە رۆح لە سەدەکانی ناوەراستدا دەژین». ئەم دووفاقیێتییەش مایەی سەرسرمانە، بەڵام دەتوانین ئەم حاڵە وەها لێک بدەینەوە کە فێندەمێنتالیستەکان تەکنۆلۆجیای خۆرئاوایان پێ قبووڵە، بەڵام بێز لەو فەلسەفە زانستی و رۆشنگەرییە دەکەنەوە کە بووە مایەی خوڵقاندنی ئەو تەکنۆلۆجیایە. واتە ئەوان بەکارهێنانی تەکنۆلۆجیا تەنیا بۆ یەک مەبەست بە حەڵاڵ دەزانن، ئەویش بڵاوکردنەوەی ئایدیۆلۆجیا تیۆلۆجی و تاریکخوازییەکەی خۆیانە. بۆ ئەم کارەشیان هەموو شتێک بە حەڵاڵ دەزانن و هەموو رێگەیەک دەگرنەبەر، تا بیر و بۆچوونی خۆیان بگەیەننە تەواوی دنیا.

فێندەمێنتالیستەکان بۆیە دژایەتی مۆدێرنە دەکەن و رەتی دەکەنەوە، لەبەرئەوەی بە قەناعەتی ئەوان بەرهەمی کوفر و دەستی کافرانە. بەڵام ئەوەی ئەوان پەسندی دەکەن، ئامرازەکانی تەکنۆلۆجیایە و ئەوەشی تەرێزی لێ دەکەن رۆحی تەکنۆلۆجیایە "واتە فیکری فەلسەفی و زانستییە" کە بە مەترسییەکی گەورەی دەزانن بۆ سەر عەقیدە و بیروباوەڕی خۆیان.. لەبەرئەوەیە ئامادەن تەواوی ئامێر و ئامرازەکانی تەکنۆلۆجیای مۆدێرن، بۆ مەبەستی وێرانکردنی کولتووری خۆرئاوایی بەکاربهێنن. بەڵام لێرەشدا جێی خۆیەتی باس لەوە بکەین کە بەجیهانیبوونی سەرمایەداری، خاڵییە لە هەر رەهەندێکی ئینسانی و ئەخلاقی و بەشێک لە ناهەمواریی هەلومەرجی دنیای ئەمڕۆش لە ئەستۆی ئەودایە. هەر لەبەر ئەمەشە "باربێر" لە ناونیشانی کتێبەکەیەوە، هێرش دەکاتە سەر هەردوولایان و رەخنە لە هەردووکیان دەگرێت.

ئەوەتا بە ئەمەریکاییکردنی جیهان شان بە شانی هەژاری و بێکاری و ناعەدالەتی و نەبوونی یەکسانی ڕێ دەکات و هەستی ئەوەت تێدا دروست دەکات کە تۆ قوربانیی دەستی بازاڕی نێو دەوڵەتیت، پاشان هەست دەکەیت پێشوەخت چارەنووست لەلایەن ئەو هێزە نادیارانەوە دیاری دەکرێت کە لە پشتی پەردەوەن، یاخۆ لە ڕێگەی پەنجەنان بە دوگمەیەکدا ئەو کارە دەکەن. بۆیە گەر ئاڕاستەی بەجیهانیبوون ڕێک نەکەینەوە، ئەوا شەڕ لە دژی بزاوتە ئسووڵییە توندڕۆکان سەرکەوتوو نابێت. فێندەمێنتالیستی جیهادی ڕقی لە ئەوی دییە، لەبەرئەوەی خاوەن بیروڕا و ئاین و ئاینزایەکی ترە.

لێرەوە سڕینەوە و تەنانەت کوشتنیشی بە کارێکی شەرعی و ڕەوا دەزانێ ، تەنیا لەبەرئەوەی سەر بەو هەقیقەتە موقەدەسە نییە کە ئەو بڕوای پێیەتی. بە بڕوای فێندەمێنتالیزم کەسێکی وا هەر بوونی نییە، چونکە وەکو خەڵکی دەڵێت: «ئیمانی لە دڵدا نییە». بۆیە کەسێکی وا بە نەفرەت دەکرێت و وەکو دەعبا یان وەکو نەبوو لێی دەڕوانرێت. لێرەوە کوشتن و تیرۆرکردنی ئەوانە "بە تاک یان بە دەستەجەمعی" مەسەلەیەک نییە، بگرە ئەنجامدەرانی پێیان وایە کارێکی حەڵاڵە و خوا پێی خۆشە.

بێگومان هەموو فێندەمێنتالیستێک پێی وایە تەنیا ئاین و بیروباوەڕی خۆی ڕاستە و ئاینەکانی تر گومڕان، بەڵام بۆ تەنیا ساتێک چییە بیر لەوە ناکاتەوە کە فێندەمێنتالیستەکانی تریش کتومت وەکو ئەو بیر دەکەنەوە. بۆ نموونە فێندەمێنتالیستێکی کاتۆلیکی پێی وایە، تەنیا بیروباوەڕی خۆی ڕاستەو خواش تەنیا ئەوەی بەلاوە پەسندە. ئەم حاڵەتەش لای فێندەمێنتالیستێکی یەهوودی یان هندۆسی یاخۆ بوودایی و کۆنفۆشیۆسی و... هتد، هەیە. هەرچی سیستمی سەرمایەداریی جیهانیشە، تەنیا وەکو ئامێرێکی بەرخۆری و ژمارەیەک لە مرۆڤ دەڕوانێت و تەنیا خەم و خولیاشی فراوانکردنی بواری بازرگانی و قەبەکردنی کۆمپانیاکانییەتی لە سەرتاسەری جیهاندا. بەرەنجامی ئەم پرۆسەیەش چ ماڵوێرانی و نەهامەتی

و برسیەتییەکی لێ دەکەوێتەوە، بۆ ئەو گرینگ نییە و گوێی ناداتێ .

ئەوەی لە هەردوو حاڵەتەکەشدا ئافەرۆز دەکرێ و هیچ حسابێکی بۆ ناکرێت مرۆڤە. ئەگەرچی سڕینەوەی مرۆڤ لە نێوان ئەو دوولایەنەدا جیاوازە، چونکە سیستمی سەرمایەداری "لانی کەم لە رووی تیوریەوە" کوشتنی مرۆڤ حەلاڵ ناکات، لەبەرئەوەی سەرمایەداری ئایدیۆلۆجیایەکی تیۆلۆجی نییە، بگرە ئایدیۆلۆجیایەکی مادیی رووتە. بێگومان ئەو فەیلەسووفانەی بەم دواییانە دەستیان دایە رەخنەگرتن لە مۆدێرنەی خۆرئاوایی ئەو مەسەلانەیان بە روونی دەبینی، ئەوەتا دەڵێن: «ئاشکرایە ئەقڵ و زانست و تەکنۆلۆجیا شتگەلێکن کە بەراستی لە خزمەتی پێشکەوتندان، بەلام رەنگە خزمەت بە چەوساندنەوە و ئیمپریالیزمیش بکەن».

ئەمەش مانای وایە مۆدێرنە برێتییە لە دیاردەیەکی دیالەکتیکی و لە گۆڕانبوونی بەردەوامدایە، بەلام لە بەرامبەردا خەسڵەتی سەرەکی فێندەمێنتالیستی ئاینی دۆگما ئەوەیە دیالەکتیکی نییە و تەواوی شتەکان لە روانگەی دووانەی رەش و سپییەوە دەبینێت.. بۆ نموونە ئەو وەکو فەلسەفەیەکی عەلمانیی کافر سەیری رۆشنگەری دەکات. لێرەوەیە کە کۆی شارستانییەتی خۆرئاوا لە دیدی ئەواندا شارستانییەتێکی بەد و پڕ خراپەکارییە، جگە لە بەرهەمە تەکنۆلۆجییەکانی نەبێت.

هەر لە دوتوێی ئەم کتێبەیدا "باربێر" نموونەگەلێکی ترمان لەبارەی تێکەڵبوونی ئەقڵییەتی فێندەمێنتالیستی و بەجیهانیبوونی ئەمەریکی نیشان دەدات، ئەو بەجیهانیبوونە ئەمەریکییەی چەند ساڵێکە بە ئامێر و ئامرازەکانی زانیاری و وێنە و چێشتخانە و زنجیرە تەلەفزیۆنی و مۆسیقا میللییەکانیەوە، هەموو جیهانی پڕ کردووە.. هەر بۆ نموونە مەلاکانی ئێران کە خەڵکی هان دەدەن بۆ جیهاد، خۆیان لە ماڵەوە و لە رێی

تەلەفزیۆنەکانیانەوە سەیری زنجیرە تەلەفزیۆنی "دیناستی" ئەمەریکایی دەکەن. یان کڵێسای ئەرسۆدەکسی ڕووسی کە لە دوای هەرەسی کۆمۆنیزمەوە دەیەوێت سەرلەنوێ ڕەواج بۆ ئاینی کۆن و ئسووڵی پەیدا بکات، هەر خۆی هاوکاریی سەرمایەدارەکانی ئەمەریکا دەکات، بۆ ئەوەی بازاڕی زیاتر بۆ ئاوی کانزایی پەیدا بکات و لەو شووشە پیرۆزانەی بنێت کە لەسەریان نووسراوە: "ئاوی کانیاوە پیرۆزەکان!". هەموو ئەمانەش بۆ ئەوەیە، ئەو خەڵکە سادە و ئیماندارە سەری تێ بکەن و جگە لەوە شتێکی تر نەکڕن. بەمجۆرە "سەرمایەداری و فێندەمێنتالیزم، مۆدێرنە و کۆنەپەرستی، ماتریالیزم و ڕۆحانییەت" تێکەڵ بە یەکتری دەبن.

لەلایەکی ترەوە نەتەوەپەرستەکانی سربستان، کراسی "ئەدیداس" یان لەبەر دەکرد و گوێبیستی گۆرانییەکانی "مادۆنا" دەبوون و پاشان دەکەوتنە بۆمبارانکردنی خەڵکی سڤیلی بۆسنیا لە سەرایێڤۆ. هەرچی جوولەکە توندڕۆ و نازیزستە نوێیەکانیشە، خاڵی هاوبەشی نێوانیان ئەوەیە هەردوولایان میوزیکی "ڕۆک"ی ئەمەریکایی بەکاردێنن، بۆ ئەوەی پەیامە "پیرۆزەکانی" خۆیانی پێ بگەیەننە نەوەکانی دوای خۆیان!

فێندەمێنتالیستە ئیسلامییەکانیش، لێزانانە کەوتنە بەکارهێنانی بڵندگۆ و کاسێتی تەسجیل و تەنانەت ئەنتەرنێت و نوێترین ئامێری زانیاری. هەموو ئەمانەش لە پێناو گەیاندنی بیر و بۆچوونە مەزن و وتارە ئاگرینییەکان بوو، بە خەڵک و بە جەماوەر.. ئەم تێکەڵییە سەیر و سەمەرەیەی نێوان نوێترین ئامرازی تەکنۆلۆجی و کۆنترین و دواکەوتووترین جۆرەکانی بیرکردنەوەش، بێگومان یەکێکە لە هەرە خەسڵەتە دیار و ئاشکراکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆمان.

پێدەچێت گەیشتبین بە سەردەمی عاجبایەتی و پڕ سەیر و سەمەرەترین قۆناغ.. جارێکی تر بە بیری دێنمەوە کە چەمکی "جیهاد" وەکو لە ناونیشانی

کتێبەکەدا هاتووە، مەبەست لێی بە تەنیا جیهادی ئیسلامی نییە، بگرە تەواوی ئەو فێندەمێنتالیستە ئاینییانەیە کە مۆدێرنەیان قبووڵ نییە.. تەنانەت نووسەر باس لە "جیهادی ئەمەریکی" دەکات و بەراوردی دەکات بە جیهادی ئیسلامی. چونکە گەورەترین کاری تیرۆرستی لە مێژووی ئەمەریکادا "جگە لە یازدەی سێپتەمبەر"، ئەوە بوو کە ڕاستڕەوێکی توندڕۆی ئەمەریکی لە "ئۆکلاهۆما سیتی" ئەنجامی دا و سەدان قوربانی لێ کەوتەوە.

ئەوانە هەمان ئەو دروشمانەیان هەڵگرتبوو کە توندڕۆیە ئیسلامییەکان بەرزیان کردووەتەوە، بەڵام بۆچی میدیاکانی خۆرئاوا تەنیا باس لە تیرۆرزمی ئیسلامی و توندڕۆی ئیسلامی دەکەن؟ یان بۆچی کەمینەیەکی توندڕۆ تێکەڵ بە زۆرینەیەکی میانڕەوی موسڵمانان دەکەن؟ ئەم کارە کێ دەیکات و بۆ بەرژەوەندی کێیە؟ لە بەشێکی تری ئەو کتێبەدا "باربێر" دەنووسێت و دەڵێت: «دەوروبەری ساڵی ١٩٢٨ شێخ حەسەن بەننای دامەزرێنەری کۆمەڵەی ئیخوان موسلمین، کەوتە ئیدانەکردنی ئەو تەوژمی ئیلحاد و بێ باوەڕییەی ڕووی لە وڵاتی میسر کرد و پێی وابوو ئەو تەوژمە سەرەتایەکە بۆ لاوازکردنی پایەکانی ئەخلاق و ئاین، بەبیانووی ئازادیی فیکری و فەردانییەتەوە. لۆمەی خۆرئاواییەکانی دەکرد کە چۆن ئافرەتەکانیان بە ڕووتوقووتی ڕەوانەی میسر دەکەن، یان بۆچی مەی و فیلمی سینەمایی و سەما و ڕۆژنامە و گەمە بێتام و شتە ناشیرینەکانی خۆیانمان بۆ دەنێرن».

بەمجۆرە شێخ "حەسەن بەننا" پێش سەردەمی بەجیهانیبوونی ئەمەریکایی کەوت و بەرلەوەی ڕوو بدات و سەرتاپای جیهان بگرێتەوە، بەچاوی خۆی بینی. ئەو پێی وابوو شالاوی کولتووری ئەوروپایی بۆ سەر میسر و تەواوی وڵاتانی جیهانی ئیسلامی، زۆر لە شالاوی سەربازی و کۆلۆنیالیستی مەترسیدارترە.. ئەو درکی بەوە کردبوو کە ئەوەی کۆلۆنیالیستی ڕاستەوخۆ نەیتوانی بە ئەنجامی بگەیەنێت، شالاوی

کولتووری جێبەجێی دەکات. ڕەنگە بتوانرێت لەشکرە سەربازییەکان لەسەر سنوور ڕابگیرێن و نەهێڵرێت ئاودیو ببن، بەڵام بیرو بۆچوون سنوور بەزێنە و ڕێی پێ ناگیرێت. ئەم قسانەی "حەسەن بەننا" هیچی لە قسەی پیاوانی ئاینی مەسیحی لە ئەورووپا و ئەمەریکا جیاوازتر نییە و لە قسەی پاپاکانی ڤاتیکان دەچێت.

لەم بارەیەوە و بۆ سەلماندنی ڕاستیی قسەکانمان، نموونە بە یەکێک لە سەرکردەی بزاوتە پرۆتستانتییە توندڕۆیەکانی وڵاتی ئنگلستان دێنینەوە کە ناوی "براین"ە. ئەم پیاوە زۆر بە توندی کەوتە ئیدانەکردنی شانۆ، چونکە بە بڕوای ئەو شوێنێکی وا برەو بە خراپەکاری و بەدڕەوشتی دەدات. دەیوت شانۆگەرییەکان پڕن لە دیمەنی بێ بڕوایی و ئەو سۆز و ئارەزووانەی، ئەخلاقی خەڵکی خراپ دەکەن. هەروەها پێی وابوو ژیانی مۆدێرن پڕیەتی لەو دیاردانەی پێچەوانەی ژیانی پڕ فەزیلەتی مەسیحییە، وەکو: «سەماکردن و قومار و میوزیکی پۆپ و دیاریی کریسمس و زۆر پێکەنین و. هتد»، تەواوی ئەم شتانەش لە زیکری خوا غافڵمان دەکەن.

ئەم قسانەی "براین" زۆر جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە لەگەڵ قسەی سەرکردە فێندەمێنتالیستەکانی ئەمەریکای وەک: "بات ڕۆبێرتسۆن و بات بۆکانان" کە داوای گەڕانەوە دەکەن بۆ ئەو بەها خێزانییانەی لە ئەمەریکای سەدەی نۆزدەمدا باڵادەست بوو. هەروەها داوا لە خەڵکی دەکەن سەردانی کڵێسا بکەن و سرووتە ئاینییەکانیان جێبەجێ بکەن، هاوکات سەرلەنوێ نوێژکردن بگەڕێنرێتەوە ناو خوێندنگەکانی ئەمەریکا، پاش ئەوەی سیستمی عەلمانی بە بڕیارێک ئەو کارەی لە خوێندنگەکاندا قەدەغە کرد. بە کورتییەکەی ئەوانە دەیانەوێت بگەڕێنەوە بۆ ڕۆژگاری زێڕینی "مەسیحی - پرۆتستانتی" ئەمەریکا.

"باربێر" دواجار بەوە کۆتایی بە قسەکانی دێنێت کە بڵێت: «بەڵێ

مـــۆدێرنە تەنانەت لە نـاوجـەرگـەی ئەمـــەریکاشـــدا کـــە دڵی زیندووی سـەرمـایەداری و بەجیـهانیبوون و مۆدێرنەیە، دوژمنی سـەرسـەختی هەیە! ئەوانە ڕقیان لەو کولتوورە دنیاییەیە کە باڵی بەسەر کۆمەڵگەی ئەمەریکیدا کێشـاوە و ئەوانیش پێیـان خـۆش بێت یان نـا لەناویدا ژیان دەگـوزەرێنن».
بەڵام چارەســەر چییـــە بۆ ئەوەی لە هەڕەشـــە و مـــەترسـیی هەریەک لە فێندەمێنتالیزمی ئاینی و بەجیهانیبوونی سەرمایەداری چاوچنۆک قوتارمان بێت؟ بێگومـان چارەسـەر ئەوە نییە لە بەجیهانیبوون بکشێینەوە و خۆمـان دوورەپەرێز بگرین، بگرە لەوەدایە بەجیهانیبوون وا لێ بکەین زیاتر و زۆرتر دیموکراسیتر و دادپەروەرانەتر و مرۆڤانەتر بێت.

چونکە سـەرمـایەداری هەر هەمـووی خراپ و بێکەڵک نییە، بگرە گـەلێک ئیـجابییـاتی تێدایە کە چاوپۆشی لێ ناکرێت. گەر وا نەبوایە چۆن دەیتوانی بەسەر سیستەم و ئایدیۆلۆجیاکانی تردا سەربکەوێت.. تەنیا کارێک پێویست بێت بیکەین، ڕاستکردنەوەیەتی و بەرگـرتنە لە لادان و سـەرەڕۆییـیەکـانی. هەرچی پێوەندی بە ئاینیشـەوە هەیە، ئەوا دەبێت جیـاوازی بکەین لە نێوان ئەو جەوهەرە ڕۆحانی و ئەخلاقییەیدا کە لەسەروو هەموو شتێکەوەیە، لەگەڵ ئەو ئایدیۆلۆجیا توندڕۆیانەی خۆیان دەبەنەوە سـەر ئـاین و وەک زمـانحـاڵی ئاین قسـە دەکەن، بـەڵام لە ڕاسـتیـدا کـاری ئەوان خیـانەتکردنە دەرهەق بە ناوەڕۆکی پەیامی ئاینی و شێواندنی مانا ڕووحییە جوانەکانی ئاین.

## جیهانگیری

لە شەستەکانی سەدەی بیستەمدا سۆسیۆلۆجستی کەنەدی "هێربەرت مارشاڵ ماکلۆ هان"، پێشبینیی ئەوەی کرد بە هۆی ئامرازەکانی ڕاگەیاندنەوە، جیهان بگۆڕێت و ببێت بە گوندێکی گەردوونی.. لە ڕابردوودا ئەوەی لە چین ڕووی دەدا بەلای ئەوروپاییەکانەوە گرینگ نەبوو، گرینگیش بوایە دوای چەندین مانگ و ساڵ پێیان دەگەیشت. بەڵام هەنووکە بچووکترین ڕووداو لە کاتی خۆیدا و لە ڕێی کەناڵە ئاسمانییەکانەوە دەبینین. یەکێک لە پسپۆڕەکان بەم دواییە هەوڵی دا جیهانگیریمان بۆ ڕوون بکاتەوە، لەم بارەیەوە دەڵێت: (لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا هەواڵێک لە شاری ئەسکەندەریەوە بۆ ئەوەی بگەشتایەتە ڕۆما، بە تێکڕایی پێویستی بە سەعاتێک بۆ هەر کیلۆمەترێک هەبوو. با وای دابنێین ماوەی نێوان ئەو دوو شارە هەزار کیلۆمەترە، کەواتە گەیشتنی هەواڵێک هەزار سەعاتی پێدەچوو، واتە زیاتر لە چل ڕۆژی دەویست. ڕەنگە هەواڵێکی وا فەرمانێک بێت، ئیمپراتۆری ڕۆمانی دەری کردبێت بۆ ئەوەی دەسەڵاتی هەرێمایەتی لە شاری ئەسکەندەریە جێبەجێی بکات. بەڵام لە سەدەی هەژدەدا ڕەوشەکە باشتر بوو، بۆ نموونە هەواڵێک لە لەندەنەوە بۆ ئەو شارانەی سێسەد کیلۆمەتر لێیەوە دوور بوون، لە ماوەی چوار ڕۆژدا دەگەیشت.. لە ساڵی ١٨٥٦ نامەیەک لە لەندەنەوە بۆ شاری بۆمبای، لە ماوەی بیست و چوار کاتژمێردا دەگەیشت. بەڵام هەنووکە لە ڕێی ئیمەیل و ئەنتەرنێت و مۆبایل و کەناڵە ئاسمانییەکانەوە، لە ماوەی چرکەیەکدا هەواڵی ئەم پەڕی دنیا بەوپەڕی دنیا دەگات.. سەرەتاییترین پێناسەی

جیهانگیری بریتییه لەوەی کە بە هۆی تەکنۆلۆجیای زانیاری و ئامرازەکانی پێوەندی، کات و ماوەکان کورت دەکاتەوە. ئەنتەرنێت و ئیمەیل و مۆبایل، هەموویان شتگەلێکن لە ماوەی چوار پێنجساڵی ڕابردوودا دۆزراونەتەوە و لە بارياندایە لە ماوەی چەند چرکەیەکدا، بەشە جیاجیاکانی جیهان بەیەک بگەیەنن. ئەمڕۆکە تەواوی دانیشتوانی جیهان لە یەک کاتدا یارییەکانی جامی جیهانی دەبینن و وەکو یەک هەڵدەچن. بە جۆرێکیش لە دەوری تەلەفزیۆنەکان خڕ دەبنەوە، وەکو ئەوەی هەموویان دانیشتووی یەک گوند بن و وەکو یەکیش دڵخۆش دەبن و ئاهەنگ دەگێڕن.. بەڵام لە ڕابردوودا لە یەکدی دابڕاو بوون و وایان دەزانی هەریەکەیان لە ئەستێرەیەکی جیاوازدا دەژی، تەنانەت هەندێکیان بە هیچ شێوەیەک ئاگاداری بوونی ئەوانی دیکە نەبوون.. لەم سەروبەندەدا کەناڵە ئاسمانییەکان ڕۆڵێکی گەورەیان لە نزیککردنەوەی میللەتانی دنیادا بینیوە). لەبارەی جیهانگیری پێناسەی تر هەیە، لە دەرەوەی ئامرازەکانی زانیاری کە کاریگەرییەکی ئەفسووناوییان هەیە و دەتوانن لە ماوەی چرکەیەکدا، ئەو سەری دنیا بەم سەری دنیاوە ببەستنەوە.

لە ڕاستیدا چەمکی جیهانگیری بەر لە بیست ساڵ لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا هاتە ئارا، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا تەمەنی ئەم چەمکە لە دە ساڵێک تێپەڕ ناکات. بەر لە هەموو شتێکیش جیهانگیری مانای ڕزگاربوونی ئاڵوگۆڕدی بازرگانی، لە هەموو کۆسپ و تەگەرە گومرگییەکان دەگەیاند. بریتی بوو لە بە جیهانیبوونی کەلوپەل و شتومەکەکان لە سەرتاسەری گۆی زەویدا، ئەمەش ئەوەی دەگەیاند کە جیهان دەبێتە یەک بازاڕی کراوە، بۆ کێبڕکێی نێو دەوڵەتی لە نێوان شمەک و کەلوپەلی ولاتانی جیهاندا. کەواتە مانای یەکەمی جیهانگیری، ئابووری و تەکنۆلۆجی بوو، بەر لەوەی لە ماوەی دواییدا بگۆڕێت بۆ کولتووری و سیاسی و تەنانەت بۆ ململانێی شارستانیش!

له نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا پرۆسەی جیهانگیری خێراتر بوو، بە تایبەت پاش لێکهەڵوەشانی یەکەتی سۆڤیەت و گۆڕانی ئابووری چین بە ئابوورییەکی سەرمایەداری، ئەگەرچی سیستمی سیاسی ئەو وڵاتە هەر کۆمۆنستییە.. بوون بە ئەندامی چین لە ڕێکخراوی بازرگانی جیهانیدا، بووە مایەی یەکخستنی بازاڕی نێودەوڵەتی، بە تایبەت کە ڕووسیا و وڵاتانی ئەورووپای خۆرهەڵات کەوتنە پەیڕەوکردنی مۆدێلی سەرمایەداری.

پاشان جیهانگیری لە ڕەوتێکی ئابوورییەوە بوو بە پرۆسەیەکی کولتووری، دوای ئەوەی فیلم و زنجیرە تەلەفزیۆنییە ئەمەریکاییەکان بازاڕەکانی دنیایان پاوان کرد. هاوکات لە ڕێی کۆکاکۆلاو ماکدۆناڵد و کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکانەوە، ئەمەریکا توانی دەست بەسەر ئابووری جیهاندا بگرێت. ئەم کارەش فرەنساییەکانی جاڕس کرد، بەڵام داخۆ دەتوانن چی بکەن؟ ئەڵبەتە دەیانەوێت بەقەد توانای خۆیان بەرخورد بکەن و دژی ئەو پرۆسەیە بوەستنەوە. ئەمە وای کرد هەندێک لە بیریاران زۆر بە سادەیی بڵێن: «جیهانگیری واتە بە ئەمەریکاییکردنی جیهان!». هەروەها ئەوانە پێیان وایە جیهانگیری دیاردەیەکی زۆر تازە نییە و پێشینەی لە ڕابردوودا هەیە. بۆ نموونە جیهانگیری لە سەدەی نۆزدەدا جیهانگیرییەکی ئینگلیزی و فرەنسایی و ئەڵمانی، واتە ئەورووپایی بوو، بەڵام هەنووکە بووەتە جیهانگیریی ئەمەریکایی. لەبەر ئەوە چاخی زێڕینی یەکەمی جیهانگیری، لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمەوە دەست پێ دەکات و تا سەرەتاکانی جەنگی جیهانی یەکەم دەخایەنێت.

لە ساڵی ١٩١٤ بەدواوە شۆڕشێکی تەکنۆلۆجی ڕووی دا کە بووە مایەی لێک نزیککردنەوەی بەشە جیاجیاکانی دنیا. ئیتر بۆ یەکەم جار هێڵی شەمەندەفەر و تەلەفۆن و کەشتیی بازرگانی و ئۆتۆمبێل و تەنانەت ڕۆژنامەش پەیدابوو. بەم ئامرازانەوە ئەورووپا کەوتە خۆی، بۆ ئەوەی دەسەڵاتی بەسەر جیهاندا بسەپێنێ و مرۆڤایەتیش ناچار بکات شێوازی

شـارسـتـانـيـيـەتـی ئەو قـبـوڵ بکەن، هەمـوو ئەمـانەش لە ڕێی پرۆسـەی کۆلۆنیالیزمـەوە.. بەڵام جیـهـانگیـری دوای دوو جـەنگی جیـهانی گەورە کە شـەڕی سـاردی بـەدوادا هـات، گـۆڕزێکی کـاریگەری بەرکـەوت. لەبـەرئەوە جیـهانگیریی دووەم، واتـە ئەوەی ئێستا ئێمـە لە سـایەیدا دەژین، تەنیا ئەو کاتە سـەرکەوت کە بلۆکی خۆرهەڵات هـەرەسـی هێنا. بەمـجۆرە دەرگـای دنیا بە ڕووی ئەمـەریکا و خـۆرئاواییـیـەکـاندا کـرایەوە و بوونـە هێـزێـک کـەس ملـمـلانێی نەدەکـردن. تەنـانەت کـار گـەیشـتـە ئەوەی لیـبـراڵیـزم بـوو بە ئایدیۆلۆجیای باڵادەستی جیـهان. تەنیا دوو هێز لە بـەرامبـەر لیبراڵیزمـدا وەسـتـانەوە: ئـایدیۆلۆجـیـای فـێندەمـێنتـالیـسـتی توندڕۆ لەلایەک و هێـزە چەپرەوەکانی ناوەوەو دەرەوەی خۆرئاوا کە دژ بە جیـهانگیری سـەرمایەداری بوون، لە لایەکی تر. یەکەمیان بۆ دژایەتیکردنی خۆرئاوا کاری خۆتەقاندنەوە و پەلاماری تیرۆرستی بەکار دێنێت، بەڵام دووەمیان شێوازی خۆ پیشاندانی هێـمنانـە و جـەمـاوەری دەگـرێتـە بەر، وەکـو ئەوەی لە: «سـیـاتل و جـەنەواو لەندەن و ژنێف و پۆرتۆ ئەلیگری»، بینیمان.

فێندەمێنتالیستەکان دەخوازن جیهانگیری لە ڕەگوڕیشە هەڵکەنن، چونکە ئەوان پێـیـان وایە پرۆسـەیەکـە هـەر هەمـووی گـەندەڵی و خـراپەکـاری و بەدڕەوشتییە. لە کاتێکدا چەپەکان تەنیا دەیانەوێت جیـهانگیری ئاڕاسـتە و ناوەڕۆکی خـۆی بگۆڕێت، چونکە ئـەوان دەزانن جیـهانگیـری بەهۆی ئامـرازە نوێیەکانی پێوەندیکردنەوە بۆتە واقیع، لە ڕاستیدا دیاردەیەکی پۆزەتیڤیشە. بەڵام دەشێت وای لێ بکرێت زیاتر مرۆڤدۆستانەتر بێت و کەمتر بەربەرییانە بێت.. ئەم جیـهـانگیـرییـەی ئێسـتا لە ئارادایە، سەرەتا وەها بانگەشـەی بۆ دەکرا کە بەختەوەری لەسـەر زەوی بەدی دێنێت و ئازادی و دیموکراسیش بۆ سـەرجـەم مـیللەتان دەسـتـەبەر دەکـات، بەڵام تا ئێـسـتـا ئەوەی کـردوویەتـی دەوڵەمـەندەکـانی زۆر زیـاتر دەوڵەمـەندتر کـردووە و هەژارەکـانیـش هەژارتر بوون.

بەپێی ئاماری نەتەوە یەکگرتووەکان، نیوەی دانیشتوانی جیهان تا ئێستاش بە کەمتر لە دوو دۆلار ژیانی ڕۆژێکیان بە ڕێ دەکەن! بەڵام جیاوازیی نێوان هەژاری جاران و هەژاریی سەردەمی جیهانگیری ئەوەیە، ئەمیان دەتوانێت لە ڕێی کەناڵەکانی تەلەفزیۆنەوە ئەو دەوڵەمەندییە زۆرەی خۆرئاوا ببینێت، لە کاتێکدا هەژاریی جاران ئەم شتانەی نەدەبینی و وەکو هەژارانی ئەمڕۆ هەستی بە مەحروومی و نائومێدی قووڵ نەدەکرد.

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا هەژاری بووەتە سکاندالێک و تەحەمول ناکرێت، ئەمەش کەلێنێکی گەورەیە لە شارستانییەتی ئەمڕۆدا. ئەم هەژارییەش بەرەنجامی بەتالانبردنی جیهانی سێیەم نییە لەلایەن جیهانی سەرمایەدارییەوە وەکو زۆرێک پێیان وایە، بگرە ئاکامی فەرامۆشکردنی کەنارە لەلایەن سەنتەرەوە. جیهانگیری برسی و ڕووت و ڕەمجاڵەکانی جەنگەڵەکانی ئەفریقیا ناچەوسێنێتەوە، بگرە ئافەرۆزیان دەکات و پشتگوێیان دەخات. ئەمەش زۆر لە چەوساندنەوەیان ترسناکترە، چونکە ڕەنگە لە ئەنجامی چەوساندنەوەیان خێرێکیان لە دەست بوایەتەوە و هەژاران هەندێک شتیان دەسگیر بوایە.. ئەم خەسڵەتە نامرۆڤانەیەی کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان و ژیاریی خۆرئاوا، دواجار دەبێتە مایەی ئەوەی هێزگەلێک نەفرەتی لێ بکەن..

قەڵاچۆکردنی تیرۆر بە زیادکردنی خەرجی سەربازی نابێت. مادامەکی ساڵانە برسییەتی ملیۆنەها کەس بکوژێت و ملیۆنانی تریش بەدەردەسەری بژین، جیهان ئارامی بەخۆیەوە نابینێت و ڕێک نابێتەوە. لێرەوە بەگژاچوونەوەی تیرۆر بەبێ چارەسەرکردنی هەژاری و برسییەتی، کارێکی بێهوودەیە. ئەمە هەقیقەتێکە کارشوناسانی خۆرئاوا خۆیان باسی لێ دەکەن.. بۆ ئێمەش کێشەکە لەوەدا نییە، ئاخۆ لەگەڵ جیهانگیریداین یان دژایەتی دەکەین؟ بگرە ئەوەیە ئاخۆ ئێمەش لێی بەهرەمەند دەبین، یاخۆ هەر لە دوورەوە لێی دەڕوانین؟

تەواوی میللەتانی دنیا دەخوازن داخڵ بەسەردەمی جیهانگیری بن، بەڵام کێشەکە ئەوەیە زۆربەیان ناتوانن، مادامەکی تەنیا پاوانە بۆ میللەتە دەوڵەمەندەکان. کێ دژ بە بەجیهانیبوونی نان و شیر و دیموکراسی و مافەکانی مرۆڤ و تۆلێرانس و خۆشگوزەرانی و تەنانەت فیلمەکانی هۆلیوودیشە. کەواتە ئێمە بە گشتی دژ بە جیهانگیری نین، بگرە دژ بە لادان و خۆپەرستییەکەین.. شایەنی باسە قوربانییەکانی جیهانگیری خەڵکانێکی زۆرن، نەک تەنیا لە دەرەوەی خۆرئاوادا، بگرە لەناو خودی خۆرئاوا خۆشیدا. سۆسیۆلۆجستی فرەنسایی "پیربۆردیۆ" لە کتێبی "بێنەوایی جیهاندا"، پەردە لە ڕووی ئەو هەژارییە زۆرە هەڵدەماڵێت کە لە ناوچەرگەی کۆمەڵگە ئەورووپییەکاندا هەیە، بەشێکیان کۆچبەرەکانن و بەشەکەی تریشیان ئەوانەن بەڕەچەڵەک فرەنسایین و خەڵکی ئەسڵی وڵاتەکەن.

## خۆرهەڵاتناسی ـ خۆرئاواناسی

ئێمە زۆر باس لە خۆرهەڵاتناسی و خۆرهەڵاتناسان دەکەین، بەڵام بە دەگمەن قسە لە خۆرئاواناسی و خۆرئاواناسان دەکەین.. شایەنی باسە خۆرئاواناسی زانستێکە پێچەوانەی زانستی خۆرهەڵاتناسییە. ئەگەر خۆرهەڵاتناسی بریتی بێت لە لێکۆڵینەوەی شارستانییەتەکانی خۆرهەڵات، ئەوا خۆرئاواناسی بریتییە لە لێکۆڵینەوە لە شارستانییەتی خۆرئاوا. بەڵام پێویستە بڵێین خۆرهەڵاتناسی وەک دیاردە و زانستێک پێش خۆرئاواناسی هەبووە.

خۆرهەڵاتناسی وەکو توێژەری فەرەنسایی "ژیرار لوکلێر" دەڵێت، لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە و سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەمدا، واتە پاش پەلاماردانەکەی "ناپلیۆن بۆناپارت" بۆ سەر وڵاتی میسر ۱۷۹۸- ۱۸۰۱ دەستی پێ کرد. ڕاستە ئەم پەلاماردانە لە ڕووی سیاسییەوە شکستی هێنا، بەڵام لە ڕووی فیکری و ئایدیۆلۆجییەوە سەرکەوتوو بوو. ئەمەش بوو بە سەرەتایەک بۆ دروستبوونی زانستی خۆرهەڵاتناسیی نوێ. وەکی دەزانرێت "ناپلیۆن" لەو هەڵمەتە سەربازییەیدا زیاد لە ١٦٧ زانای لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، ئەو زانایانەش سەر بە بوارە جیاجیاکانی وەک: "ئەندازیاری، گەردوونناسی، کیمیاگەر، پزیشکی، فەلسەفە و.. هتد" بوون.

بەمجۆرە لێرەدا دەبینین ئیرادەی هێز پشت ئەستوورە بە ئیرادەی مەعریفە، ئەمەش ئەو پەیوەندییەیە کە لە سەرەتاکانییەوە ئاراستەی خۆرهەڵاتناسی کردووە. بەڵام نابێت ئەمەش وامان لێ بکات کۆی ئەو پرۆژەیە وەک پرۆژەیەکی کۆلۆنیالی سەیر بکەین و وا بزانین جگە لە

خۆسەپاندن و دروستکردنی هەژمونگەری بەسەرمانەوە، خواستێکی تری نییە. ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە کە زۆربەی ڕۆشنبیرانی عەرەب تا ئێستاش تێی دەکەون.

لە ڕاستیدا خۆرهەڵاتناسی زانستێکی حاشا هەڵنەگرە و زانیارییەکی زۆر و زەوەندیشی سەبارەت بە کەلەپوور و کۆمەڵگەکانی ئێمە کۆکردووەتەوە. بۆ نموونە سێ سەد لێکۆڵیار لە نووسینی کتێبی "وصف مصر"دا بەشدار بوون کە کتێبێکی قەوارە گەورەیە و لە نۆ بەرگ پێکهاتووە و لە نێوان سالآنی (١٨٠٩-١٩٢٨)دا دەرچووە. ئەم کتێبە بە سەرەتای دروستبوونی زانستی میسرناسی یاخۆ شارستانییەتی میسرناسی دادەنرێت، وەک چۆن بە دامەزراندنی زانستی خۆرهەڵاتناسیش دەدرێتە قەڵەم. ئەم پرۆژەیە گرینگیی زیاتر بە مێژووی کۆنی میسر دەدات، واتە میسری سەردەمی فیرعەونییەکان کە قۆناغی بەر لە هاتنی ئاینی ئیسلام دەکات، بەڵام ئەم کتێبە سەرەتایەکیشە بۆ هاتنە ئارای زانستی ئیسلامناسی، لەبەرئەوەی زاناکانی سەردەمی "ناپلیۆن"، هاوکات بە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگەی میسری ئەو سەردەمەشەوە سەرقاڵ بوون.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا، سەردانی گەڕیدە ئەورووپاییەکان بۆ ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست "میسر، فەلەستین، سووریا" زیادی کرد. ئەوەی ڕێخۆشکەریش بوو لە بەردەم ئەم کارەدا، کرانەوەی ناوچەکە بوو بە ڕووی دەرەوەدا، بە تایبەت پاش لاوازبوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئەو سیاسەتە ڕیفۆرمییانەی "محەمەد عەلی" والی وڵاتی میسر دەستی دابوویە. بەڵام ئەو گەڕیدانە خۆرهەڵاتناسی ڕاستەقینە نەبوون، بگرە زۆربەیان نووسەر بوون و لەناو بۆن و بەرامەی خۆرهەڵات و کەشوهەوا ئەفسووناوییەکەیدا بە دوای ئیلهامدا دەگەڕان، لەوانەش: «شاتۆ بریان، لامارتین، ئەلیکسەندەر دۆما، جێراردی نێرڤال». "نێرڤال" کتێبێکی گەورەی بەناونیشانی "سەردانێک ڕووەو خۆرهەڵات" نووسی. هەروەها چەند

نووسەرێکی تری وەک: "گۆبینۆ و فلۆبێر و.. هتد".

پاشان سەرەی گەورە خۆرهەلاتناسانی ئەوروپا هات کە بە مەبەستی لێکۆڵینەوە لە زمان و کەلەپووری ئاینی و عادات و ترادسیۆنی ئەو هەرێمە بە شێوەیەکی زانستی، ڕوو بکەنە خۆرهەلات. لەوانە: «ئەرنست ڕینیانی فرەنسایی، کارڵ بیکەری ئەڵمانی، هێرۆگرۆنگێی هۆڵەندی، گۆڵدزهیری هەنگاری».

لەو کاتەوە خۆرهەلاتناسی ئەڵمانی لێهاتوویی خۆی سەلماند، چونکە بەشێوەیەکی سەرەکی بایەخی بە تاوتوێکردنی تێکستە ئیسلامییە کلاسیکییەکان دەدا و بەشێوەیەکی فیلۆلۆگی و مێژووی ورد، لە هەوڵی ساغکردنەوەی دەستنووسە کۆنەکاندا بووە. واتە خۆرهەلاتناسی ئەڵمانی زۆر گرینگی بە تاوتوێکردنی هەلومەرجی کۆمەلایەتی و ئابووری کۆمەڵگە ئیسلامییەکان نەدەدا، وەکی ئەوەی لەو ماوەیەدا باو بوو. ئەوەی ڕاستی بێت لە سەرەتادا ئامانجی سەرەکیی خۆرهەلاتناسی ئەڵمانی ئەوە بوو، لەو ژینگەیە بکۆڵێتەوە کە مەسیحییەتی تێدا پەیدا بوو، زیاد لەوەی لێکۆڵینەوە لەبارەی ئیسلام بکات.

لێرەوە خۆرهەلاتناسیی ئەڵمانی بایەخی زیاتری بە باسوخواسە سامییەکان دەدا کە پێوەست بوو بە لێکۆڵینەوەی تەوراتی و ئینجیلییەکانەوە. لە خۆرهەلاتناسە مەزنەکانی ئەوسای ئەڵمانیا دەتوانین ناوی هەندێکیان بێنین، وەک: «هـ. ئیواڵد ۱۸۰۳-۱۸۷۵، ج. فیلهاوزین ۱۸٤٤-۱۹۱۸، ت. نۆلدکە ۱۸۳٦-۱۹۳۰». لە کۆی ئەمانە تەنیا "نۆلدکە" پسپۆر بوو لە زانستی ئیسلامناسیدا و دوای خۆشی کتێبێکی قەوارە گەورەی بەناوی "لێکۆڵینەوە لە قورئان ۱۸٦۰" بەجێ هێشت. دەکرێت ئەم کتێبە بە یەکەم پراکتیزەکردنی میتۆدی زمانەوانیی مێژوویی، بەسەر تێکستی قورئاندا بدەینە قەڵەم. ئەمەش وامان لێ دەکات بڵێین "نۆلدکە"

باوکی دامەزرێنەری خۆرهەڵاتناسی ئەڵمانییە، دوای "بیکەر" و نەوەی سەردەمی ئەو.

سەبارەت بە "گۆڵد زیهر" (١٨٥٠-١٩٢١)، ساڵی ١٨٧٣ سەردانی خۆرهەڵات دەکات و یەکەمین جێگەیەکیش تێیدا دەمێنێتەوە شاری قاهیرە دەبێت. "گۆڵد زیهر" یەکەمین ئەوروپاییە وەک خوێندکارێک لە زانکۆی ئەزهەردا وەردەگیرێت و وەکی تەواوی خوێندکارانی ئەوێ، بەرگی ئاینی دەپۆشێت. لەوێدا چاوی بە "جەمالەدینی ئەفغانی" دەکەوێت و پاشان سەردانی هەریەک لە قودس و دیمەشق دەکات و ساڵی ١٨٦٤ بە کتێب و دەستنووسێکی زۆرەوە دەگەڕێتەوە بۆدابست؛ لەگەڵ گەڕانەوەشیدا، دەست دەکات بە نووسینەوەی توێژینەوە سەرەکییەکانی لەبارەی ترادسیۆنی ئیسلامی و بەتایبەتیش لەبارەی زانستی حەدیس.

هەرچی "هیرۆ گرۆنگێی" هۆڵەندیشە ١٨٥٧- ١٩٣٦، ئەوا کوری قەشەیەکی پرۆتستانتی بووە و تیۆلۆجیای مەسیحی لە "لایدن" خوێندووە، بەر لەوەی ئاشنایەتی لەگەڵ یەکەمین نەوەی ئیسلامناسانی هۆڵەندی وەک "دوزی و گۆیز"دا پەیدا بکات. "هیرۆ گرۆنگێی" بەرلەوەی روو لە ئەڵمانیا بکات بە مەبەستی خوێندن لەسەر دەستی خۆرهەڵاتناسی گەورە "نۆلدکە"، نامە گۆڕینەوە لەگەڵ "گۆڵدزیهر"دا دەست پێ دەکات و پاشان بڕیار دەدات خۆی تەرخان کات بۆ لێکۆڵینەوەی فیقهی ئیسلامی.

ساڵی ١٨٨٤ سەفەرە گەورەکەی خۆی بۆ نیمچە دوورگەی عەرەبی دەست پێ دەکات و لە شاری جەدەدا چاوی بە زانایانی ئاینی دەکەوێت، پاش مشتومڕێکی درێژ لەگەڵیاندا کە تیایدا شارەزایی خۆی لە ترادسیۆنی ئیسلامیدا دەسەلمێنێت، زانایانی ئەوێ قبوڵی دەکەن و وەک یەکێک لە خۆیان حسابی بۆ دەکەن. دوای ئەوەی دەبێتە ئیسلام و ناوی خۆی دەگۆڕێت بۆ "عەبدولغەفار"، دەتوانێت بچێتە ناو شاری مەککەوە. لەوێدا

چەندین دەستنووسی دەست دەکەوێت و لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکی مەککە دەکۆڵێتەوە کە بە ژیانی سەدەکانی ناوەڕاست چووە. پاش گەڕانەوەی بۆ هۆڵەندا کتێبێکی گەورە لەبارەی مەککە دەنووسێت کە چەندین وێنەی لەبارەی ئەو شارە تێدایە، ئەمەش یەکەمین وێنەیە لەبارەی ئەو شارە لەبەردەستماندا بێت.

لێرەدا گەر دەرفەت هەبوایە، ئەوا باسمان لە لێکۆڵینەوەکانی "کارل بیکەر و گۆستاف تۆن گرۆنباوم و هاملتۆن جیب" و کەسانی تر لە دەستەی یەکەمی خۆرهەڵاتناسان دەکرد. بێگومان ئەوانە هەندێکیان پێوەندییان لەگەڵ ئیدارەی کۆلۆنیالی وڵاتەکانیان هەبوو، یاخۆ کاری ڕاوێژکارییان لە وەزارەتی دەرەوەدا کردووە و.. هتد، بەڵام ئەمە لە گرینگیی تۆژینەوە زانستییەکانیان کەم ناکاتەوە. هاوکات لێرەدا پێویستە باس لە گرینگیی ئەو باس و لێکۆڵینەوانەش بکەین کە نەوەی دووەمی خۆرهەڵاتناسان نووسیویانە و پاشان دەستەی سێیەمی خۆرهەڵاتناسانی سەدەی بیستەم دێن کە بریتین لە: "ژاک بێرک، مەکسیم ڕۆدنسۆن، جۆزێف ڤان ئیس و.. هتد".

بەڵام نابێت وا تێ بگەین کە خۆرهەڵاتناسی تەنیا تایبەتە بە لێکۆڵینەوە لە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی، بگرە خۆرهەڵاتناسییەکیش هەیە تایبەتە بە لێکۆڵینەوە لە شارستانییەت و کولتووری خۆرهەڵاتی دوور. وەک ئەو خۆرهەڵاتناسییەی بایەخ بە لێکۆڵینەوەی شارستانییەتی هیندی و چینی و یابانی دەدات. ڕاستە ئەوروپاییەکان بەر لە کەسانی تر بایەخیان بە ئێمە دا، لەبەر چەند هۆیەکی وەک: نزیکایەتی جوگرافیمان لە یەکترییی، هەروەها لەبەرئەوەی ناوچەی ئێمە شوێنە پیرۆزەکانی مەسیحییەتی لێیە کە ئاینی سەرەکیی خۆرئاوایە. بەڵام پاش ئەوەی شارستانییەتی خۆرئاوا بە هێز و دەوڵەمەندتر بوو، ئیتر ئاوڕیشیان لەو ئاین و ترادسیۆنانەش دایەوە کە یەکتاپەرستی نین. بەمجۆرە لە بەشەکانی خۆرهەڵاتناسی ناو زانکۆکانی

خۆرئاوادا دەبینین، بەشێک تایبەتە بە کەلەپووری ئیسلامی و بەشێکی تر بە کەلەپووری هێندۆسی و بوودایی و کۆنفۆشیۆسی و کەلەپووری چینی و بەشێکیش بایەخ بە کەلەپووری یابانی دەدات.

لێرەدا دەبینین خۆرئاوا توانای ئەوەی هەیە لە تەواوی ئەو شارستانییەتە مەزنانە بکۆڵێتەوە کە سەردەمانێک پێشەنگی مرۆڤایەتی بوون، ئەویش بەهۆی ئەوەی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەمەوە لە ڕووی تەکنۆلۆجی و زانستییەوە، بۆڕی سەرجەم شارستانییەتەکانی تری داوەتەوە. بەمجۆرە گەورە خۆرهەڵاتناسان لە ئەڵمانیا و فرەنسا و ئنگلستان و هۆڵەندا و.. هتد، پەیدا بوون.. خۆرهەڵاتناسیش ئەو کەسە ئەوروپاییەیە کە ژیانی خۆی تەرخان کردووە بۆ لێکۆڵینەوە لە ترادسیۆنەکانی تر. کەواتە خۆرهەڵاتناس خاڵی پێکگەیشتنی ڕۆشنبیرییە، لە نێوان کولتووری خۆیی و ئەو کولتوورە خۆرهەڵاتییەی لێکۆڵینەوەی لە بارەوە دەکات. بۆ نموونە خۆرهەڵاتناسێکی فرەنسایی کاتێک لە کەلەپووری ئیسلامی دەکۆڵێتەوە، ناچار دەبێت زمانی عەرەبی فێر ببێت، بۆ ئەوەی لە دەستنووس و تێکستەکان تێ بگات. هەندێ جاریش دێت بۆ وڵاتەکانمان یاخۆ ڕوو دەکاتە زانکۆکانمان، بە مەبەستی ئەوەی بەچاکترین شێوە زمانەکەمان فێر بێت ئاشنایەتیی زیاتر لەگەڵ کولتوور و کەلەپوور و میللەتانی ئێمەدا پەیدا بکات. هەندێک جار ڕادەی سەرسامیی ئەو خۆرهەڵاتناسانە بە کەلەپوور و شارستانییەتی ئێمە دەگاتە ئەوەی، ئاینی خۆیان بگۆڕن و بێنە سەر ئاینی ئیسلام، نموونەی وەک ئەوەی لە "ڤانسان مۆنتێل" ڕووی دا و ناوی خۆی گۆڕی بە "ڤانسان مەنسور مۆنتێل".

کەواتە لێکۆڵینەوە لە ترادسیۆنەکانی تر، بۆ خۆی برێتییە لە پرۆسەیەکی کارلێکردنی کولتووری. کرانەوەش بەسەر کولتوورەکانی تردا و ئاشنابوون بە زمان و ترادسیۆنی ئاینی و ئەدەبی و فەلسەفیی میللەتانی تر، لە خۆیدا سەرکێشییەکی گەورەیە. ئەم پرۆسەیە دەبێتە مایەی گۆڕینی ئەو کەسە

یاخۆ دەسکاریکردنی، بەم پێیەش ئەو کەسە زۆر لە جاران زیاتر کراوەتر دەبێت.

ئەمەی باسمان کرد تایبەت بوو بە خۆرهەڵاتناسی و خۆرهەڵاتناسەکان، بەڵام بابزانین خۆرئاواناسی چییە و خۆرئاوا ناسەکان کێن؟ سەربوردەی ئەوانە چییە کە بە ئاڕاستەی پێچەوانەدا دەڕۆن، واتە ئەوانەی بە لێکۆڵینەوەی کولتوور و شارستانییەتی خۆرئاواوە خەریکن؟ چونکە ئەمانەش بۆ خۆیان ناوەندێکن بۆ بەیەکگەیاندنی کولتووری، لە نێوان عەرەب و ئەورووپا یان تورک و ئەورووپا یاخۆ فارس و ئەورووپا و.. هتد. ئەگەر خۆرهەڵاتناسەکان کاریان ئەوە بووبێت لە شارستانییەتەکانی خۆرهەڵاتیان کۆڵیبێتەوە، هەر لە شارستانییەتی ئیسلامی و هیندییەوە تا چینی و یابانی، ئەوا کاری خۆرئاوا ناسەکان کە لە شارستانییەتی خۆرئاوا دەکۆڵنەوە ئەوەیە تاوتوێی ئەو شارستانییەتە بکەن، ئیتر فرەنسایی بێت یاخۆ ئەڵمانی یان ئینگلیزی و ئەمەریکایی و... هتد.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمەوە خوێندکارانی خۆرهەڵات روویان لە زانکۆکانی خۆرئاوا کرد، وەک زانکۆی "سۆربۆن و بەرلین و ئۆکسفۆرد و کامبریدج". ئەم پرۆسەیەش تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ بەردەوامە، هەر لە "رەفاعە ڕافع تەهتاوییەوە تا ئەحمەد لوتفی سەید و تەها حسێن و محەمەد مەندوور و.. هتد". خۆرئاوا ناس ئەو کەسەیە بەشێکی ژیانی لە خوێندنی زمانە بیانییەکانی وەک فرەنسایی و ئینگلیزی و ئەڵمانیاییدا بە خەرج داوە، هەروەها کەسێکیشە لە کولتووری نوێی ئەورووپایی ئاگادارە و بە میتۆدەکانی توێژینەوەی زانستی ئاشنایە، ئەویش لە ڕێی زانینی زمانێکی خۆرئاوایی یان فێربوونی زیاد لە زمانێک. کەواتە زانستی خۆرئاواناسی هەیە، بەڕادەی ئەوەی زانستی خۆرهەڵاتناسی هەیە. زانستی خۆرئاواناسی تەنیا تایبەت نییە بە عەرەب و موسوڵمانان، بگرە لەلای یابانی و چینی و هندییەکانیش هەیە.. پاش ئەوەی لە سەدەی نۆزدەمدا شارستانییەتی

خۆرئاوا سەرکەوت و لە ڕووی زانستی و تەکنۆلۆجی و فەلسەفییەوە بالادەستیی خۆی سەلماند، ئیتر بووە قیبلەگای میللەتانی دنیا و هەمووان لە هەولی ئەوەدان زانیاریی زیاتری لە بارەوە بزانن، بۆ ئەوەی لە نهێنیی سەرکەوتن و بالادەستێتی تێ بگەن.

ژاپۆن بەمجۆرە بەسەر ئەوروپادا کرایەوە، پاش ئەوەی بۆ ماوەی چەندین سەدە بەسەر خۆیدا داخرابوو. خۆرئاواخوازیی ژاپۆن لەگەل بنەمالەی "میچی"دا دەستی پێ کرد، ئەم بنەمالەیە لە کۆتایی شەستەکانی سەدەی نۆزدەمەوە حوکمڕانیی ولاتی یابانیان گرتە دەست. ئەلبەتە هەولی کرانەوە بەسەر خۆرئاوادا زۆر پێش ئەو مێژووە دەکەوێت لە ژاپۆندا، بەلام ئەو هەولانە پچڕپچڕ و لاوەکی بوون. بنەمالەی "میچی" لەگەل هاتنیاندا دروشمی "کرانەوەیان بەسەر شارستانییەت و ڕۆشنگەریدا" بەرز کردەوە، بۆ ئەوەی ژاپۆن بگەیەننە ڕیزی جیهانی پێشکەوتوو. بەر لە سەردەمی حوکمڕانی بنەمالەی "میچی"، ئەو خوێندکارانەی لە ژاپۆنەوە ڕەوانەی دەرەوە کرابوون بۆ خوێندن، ژمارەیان لە سێسەد کەسێک تێپەڕی نەدەکرد، بەلام دوای ئەوە ژمارەیان بوو بە هەزاران و بنەمالەی فەرمانڕەواش داوای لێ دەکردن، خۆیان لە تەواوی بوارەکانی وەک: "پزیشکی و ئەندازیاری و تەکنۆلۆجیا"، بەهرەمەند بکەن و سەرجەم ئەو شتانە بۆ ولاتی ژاپۆن بگوازنەوە. لەم سەروبەندەشدا بیریارێکی وەک "فۆکۆ زاوا یۆکیشی" ١٨٣٥-١٩٠١، ڕۆلێکی گەورەی لەم بوارەدا گێڕا.

"یۆکیشی" پاشا ئەوەی سەردانێکی خۆرئاوای کرد، ئیتر کەوتە داواکردنی ئەنجامدانی گۆڕانێکی گشتی و هەمەلایەن لە ژاپۆندا و هەروەها کەوتە بانگەشەکردن بۆ خۆرئاواخوازییەکی تەواو. پاشان یەکەمین پرۆسەی وەرگێڕان لە زمانە ئەوروپاییەکانەوە بۆ زمانی ژاپۆن دەستی پێ کرد، بەمجۆرە بەرهەمەکانی "مۆنتسکیۆ و ژان ژاک ڕۆسۆ و جۆن ستیوارت میل و هربەرت سبنسەر"، بۆ سەر زمانی ژاپۆنی وەرگێڕدران. بەلام لە ژاپۆندا

وەک لە شوێنەکانی تریشدا، تەنیا کتێب تەعبیری لە مۆدێرنە و نوێبوونەوە نەدەکرد، بگرە رۆژنامە و کۆواریش بەو کارە هەڵدەستان.

لەگەڵ هاتنی سەردەمی حوکمڕانیی بنەماڵەی "میچی"یشدا، رووناکبیرانی ژاپۆن گرینگیی زیاتر و زۆرتریان بە بواری رۆژنامەگەری دەدا. ساڵی ١٨٦١ لە شاری ناکازاکی یەکەمین رۆژنامەی ژاپۆنی دەرچوو کە بە زمانی ئینگلیزی بوو. ساڵێک دوای ئەوەش یەکەمین رۆژنامە بە زمانی یابانی بڵاو کرایەوە. لێرەوە کێشەیەک لە نێوان ئەوانەی داوای کرانەوەیان دەکرد لە پێناو نوێبوونەوەدا، لەگەڵ ئەوانەی نەیاری کراوە بوون و داوای دەرکردنی بیانییەکانیان دەکرد لە وڵاتدا دروست بوو.

چونکە فێندەمێنتالیستە ژاپۆنییەکان پێیان وابوو هەرچی بیانی بێت و ژاپۆنی نەبێت، بەربەری و درندەیە. کەواتە ژاپۆنیش وەکی شارستانییەتەکانی تر لە بەرامبەر کێشەی خۆرئاواخوازیدا، لە ناوەخۆدا دووچاری کێشە و ململانێ بووەتەوە. واتە ئەمە پرۆسەیەک نییە بەتەنیا تایبەت بێت بە مسوڵمانان یان چینی و هندییەکان، بگرە لەناو هەر نەتەوەیەکدا ئاقارێک هەیە باس لە پاراستنی بنەماکان و شوناس و ترادسیۆنی ئەو نەتەوەیە دەکات و هەموو کرانەوەیەکیش بەرووی دەرەوەدا، بە هەرەشە و مەترسی دەزانێت بۆ سەر کولتوور و بەهاکانی ئەو نەتەوەیە. سەرەڕای هەموو شتێک، بەڵام دواجار ئاقاری نوێخوازەکان لە ژاپۆندا سەرکەوتن، پاش ململانێیەکی دوور و درێژ لەگەڵ فێندەمێنتالیستەکاندا، ئەوانەی ئیمپراتۆریان دەپەرست و بیروڕای ژاپۆنییەکانیان بە تاکە بیروڕای راست و دروست دەدایە قەڵەم، لە دەرەوەی ئەوەش هەموو شتێکیان بە هەڵە و گومڕایی دەزانی. فێندەمێنتالیستی ژاپۆنی پێی وابوو بە کرانەوە بەسەر ژیاری خۆرئاوادا، ژاپۆن جەوهەری خۆی لە دەست دەدات. ئەمەش هەمان ئەو قسانەیە کە فێندەمێنتالیستەکان لە هەموو جێیەکدا دەیکەن.

با لێرە بەدواوە سەرنج لە شارستانییەتی چینی بدەین. دەکرێت بڵێین بیریارێکی وەک "یەن فۆ" ١٨٥٣-١٩٢١، بە باوکی ئەنتلجنسیای چینی نوێ دادەنرێت. ئەو توانی سەرەتای بزاوتێکی وەرگێڕانی گەورە لەو وڵاتەدا دروست بکات کە لە دواتردا دەبێتە مایەی گۆڕینی کایەی ڕۆشنبیری و ئایدیۆلۆجی لە چیندا. هەروەها "یەن فۆ" بە ڕابەری ڕۆژنامەگەریی نوێی چینی ناودەبرێت و ناوبراو بۆ ماوەی دوو ساڵ لە بەریتانیا خوێندوویەتی، واتە لە نزیکەوە بە خۆرئاوا ئاشنا بووە نەک تەنیا لە ڕێی کتێبەوە. ئەو لە یەکەمین ئەو چینییانەیە کە زمانی "شکسپیریان" بە چاکی زانیوە و قسەیان پێ کردووە، هەروەها کتێبی چەندین بیریاری ئەورووپایی بۆ سەر زمانی چینی وەرگێڕاوە، لەوانە کتێبەکانی: "هربەرت سبنسەر و ئەلدۆس هکسلی و ئادەم سمێس و شارل دی مۆنتسکیۆ و.. هتد".

هاوکات بۆ خۆشی چەندین کتێبی نووسیوە و یەکێک بووە لەوانەی زۆر بە شارستانییەتی خۆرئاوا سەرسام بووە و پێیوا بووە لە سەروو ژیارەکانی ترەوەیە. ئەمە وای لێ کرد دەست بکات بە ڕەخنەگرتن لە کەلەپووری تەقلیدیی چین، چونکە پێی وابوو کەلەپوورێکی چەقبەستبووە و قودرەتی گۆڕانی نییە. ئەمەش لەگەڵ فێندەمێنتالیستە کۆنفۆشیۆسییەکاندا کێشەی بۆ نایەوە، لەبەرئەوەی ئەوانە بە ئەڵقە لە گوێی بۆ خۆرئاوا تاوانباریان کرد!

بەمجۆرە شەڕ لە نێوان ڕۆشنبیرە نوێخوازەکانی چین و ڕۆشنبیرە تەقلیدییەکانی ئەو وڵاتەدا دەستی پێ کرد، تەواو وەکی ئەوەی لە ناو ڕۆشنبیری هندی و ژاپۆنی و ئیسلامیدا ڕووی دا. شایەنی باسە بەلای زۆربەی چینییەکانەوە کۆنفۆشیۆسی بە عەقیدەیەکی فەلسەفی یاخۆ بە قوتابخانەیەکی فیکری دەدرێتە قەڵەم، بەڵام ئاینێک نییە چون ئاینی مەسیحی و ئیسلام. چونکە وەکی دەزانین چەمکی ئاین لە وڵاتی چیندا بوونی نییە، بەڵام بیر و باوەڕی کۆنفۆشیۆسی قودسییەتێکی لە ڕادەبەدەری هەیە و وەکی ئایدیۆلۆجیای ڕەسمی دەسەڵات وایە لەو وڵاتەدا، واتە

کۆنفۆشیۆسی لە چیندا وەک جۆرێک لە زانستی سیاسی سەیری دەکرێت. سەرەڕای ئەوەی عەقیدەیەکی مۆراڵی و ویژدانیی زۆربەی هاوولاتییانی چینییە، بەم پێیە دەکرێت بڵێین ڕۆڵی ئاین دەگێڕێت.

ڕەنگە پابەندبوونی هاوولاتییەکی تەقلیدیی چینی بە بیر و باوەڕی کۆنفۆشیۆسییەوە، هیچی لە پابەندبوونی کەسێکی مەسیحی یان مسوڵمان بە ئاینەکەی خۆیەوە کەمتر نەبێت. تەنانەت هەندێک لە فێندەمێنتالیستە چینییەکان دەڵێن: «کۆنفۆشیۆسی تاکە بیر و باوەڕێکی ڕاست و دروستە و پێویستە ڕۆژێک بێت تەواوی دنیا بگرێتەوە...».

گەر دەرفەتی ئەوەم بۆ هەڵدەکەوتایە بەر لە چارەکە سەدەیەک زیاتر لە ئێستا بچمە ئەورووپا، ئەوا دەژیام و دەشمردم بەبێ ئەوەی هیچ شتێک تێ بگەم! ئەزموونی ئەورووپا یەکلاییکەرەوە بوو. ئەویش لەبەر چەند هۆکارێک. یەکەمیان بواری ئەوەت دەداتێ لە خۆت و ژینگەی سەرەتاییت و دەوروبەرت دوور بکەویتەوە. بەکورتی ڕێگەت دەدا تا لە دوورەوە بڕوانیتە ڕابردووی خۆت و سەیری بیر و سارای خۆت بکەیت. واتە بواری ئەوەت بۆ دەڕەخسێنێ تا کێشەکانت لەگەڵ خۆتدا یەکلایی بکەیتەوە و بەمجۆرەش سەرشانت سووک بکەیت. دووەمیان ئەوەیە بوارت دەداتێ تا زمانێکی ئەورووپی مۆدێرن فێر ببیت. زمانێک کە بڕیەتی لە سەرچاوەی هەمەجۆر. ئەمانەت ئەمەدەنرای بەشێوەیەکی مێژوویی لە مێژووی عەرەب و ئیسلام تێ بگەم. گەر هەندێک کتێبی سەرەکیم بەزمانی فەرەنسایی بەخوێندایەتەوە.

دواجار هۆکارێکی سەرەکیی تر هەیە کە ئەویش بریتییە لە ئازادیی بیرکردنەوە و ڕادەربڕین. دەکرێت بڵێین: شکۆمەندی و شارستانییەت و باڵادەستیی ئەورووپا، بەرهەمی ئەو ئازادییەیە. ئەزموونی جیابوونەوەی ئەورووپا لە خۆی، واتە جیابوونەوەی لە شتە سڵی و نەخوازراوەکانی، بەرجەمی شتێکە لە ژیانمدا بیبینم.

هاشم ساڵح




Aras Press
Kurdistan - Erbil


ISBN 978-9933-487-59-1
9 789933 487591
بەهای ٢٥٠٠ دینار